# هەنجیری چل تام

## کۆمەڵە چیرۆکێکی فۆلکلۆری

ئامادە و کۆکردنەوەی

جەمال گردەسۆری



هەولێر - ٢٠٠٨



دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

- **هەنجیری چل تام** (کۆمەڵە چیرۆکێکی فۆلکلۆری)
- ئامادە و کۆکردنەوەی: جەمال گردەسۆری
- نەخشەسازی ناوەوە و پیتچنین: طـە حسین
- بەرگ: ئاسۆ مامزادە
- ژمارەی سپاردن: (١٠١٨)
- نرخ: (٢٢٥٠) دینار
- چاپی یەکەم : ٢٠٠٨
- تیراژ: ٥٠٠ دانە
- چاپخانە: چاپخانەی خانی (دهۆك)

**زنجیرەی کتێب (٢٥٤)**



ماڵپەڕ: www.mukiryani.com
ئیمەیل: info@mukiryani.com

## ناوەڕۆك

## پێشکەشە

* بە خوشکی شەهیدم (زبێدە ئیسماعیل حەسەن) کە رۆژی ١٩٩٥/٩/٣٠ لە کارەساتی تەقینەوەی بارەگای بەرهەڵستکارانی عێراق لە پیرمام شەهید بوو.

### خوالێخۆشبووان

* بە دایك و باوکم ئیسماعیل حەسەن ئیسماعیل و عائشە حاجی یوسف
* بەو کەسانەی خەمخۆری کۆکردنەوە و لەسەر نووسینی فۆلکلۆری کوردین.

## وتەیەك

ئەم كۆمەڵە هەقایەتە بریتین لە ئەفسانە و رووداو و هەروەها بەشێكیش لە دانراو بەڵام هەر هەمووی لە پێناو سوودوەرگرتن لەلایەنی كۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابووری و... هتد دەگرێتەوە، ئەم هەقایەتانە لەگەڵ خوێندنەوەیان دەچییە نێو دنیایەك بە ئەشقەوە بیخوێنیەوە ئەوە ئەم لایەنانەی باسم كرد بە زەقی تیادایە، بەڵام بە سانایی و یەكسەر چوونە نێو دنیایەكە نەخێر، بەڵكو بەسەرهەڵدانی ململانێ دواتر پیازێكی سپی كراوت دەخاتە بەردەست كە چۆن راستی سەردەكەوێ و فرت و فێڵەكان دەبنە بلقی سەر ئاو ئەمانە لە هەر هەموو رووەكان ئەمەم بۆ گەنجەكان بوو چونكە لە دیوەخان و شەوی درێژی زستانیان لە گوندەكان بەڕێنەكردووە، كە هەقایەتخوان بە چەندین رۆژ تاوەكو هەقایەتێكی تەواو دەكرد و گوێگرەكانیش دەچوونە نێو دنیایەكەی واتە پاڵەوانەكانی، بە تایبەت لە دیوەخانەكان ئاغای گوند هەقایەتخوانی بانگ دەكردە تەنیشت خۆی و دەیگوت ئینجا ئەمشەو بتبینم و نەتناسم لە جاران خۆشتر بێت، ئەمیش ئەم هەقایەتانەی دەگوت كە زێتر لایەنی سیاسی پێوە دیاربێت وەك پاڵەوانەكان دێو، بە تایبەت دێوی رەش و دێوی سپی و پاڵەوان بەڵام لە دنیایەكی ململانێی ئێجگار بەرفراوان یاخود ئەو هەقایەتەی كە باس لە پاشایەكی دەكرد، بەڵام لە رووای واقیعی نزیك بوو، جگە لەمانەش زۆر جار مەسەلەیەكی لە پاڵەوانانی گورگ و رێوی و كەلەباب و كەمتیار و... هتد دەگێڕایەوە، لە نێو ماڵێك زێتر هەقایەتەكان كۆمەڵایەتی بوون لە بواری ئامۆژگاری وەك ژنیش هەیە و ژانیش هەیە، یاخود دوو برا، یان سێ برا، یاخود ئەقلە و گێلە و هەیاس و سوڵتان مەحمود و هەقایەتەكانی دیكە كە زێتر چارەسەری گرفتی كۆمەڵایەتی بوون. لێرەدا خوێنەر بە تایبەت گەنجەكان لەوانەیە ئەم پرسیارە دروست بێت سەرچاوەی ئەم هەقایەتانە لەكوێ دەهاتن، هەقایەتخوان زۆر جار هەر لەم كات دروستی دەكرد، یاخود گوێبیست ببوو وەك خۆی دەیگوتەوە، هەندێكی دیكەش زیادەی دەخستە سەری، ئینجا لێرەدا ئەقلمەندیەتی هەقایەتخوان بەدیار دەكەوێت كە چۆن راستەوخۆ دروستی دەكرد و یاخود ئەم هەقایەتانەی چۆن لەیاد دەما و دووبارە لەسەرەخۆ و بە تام و چێژەكی خۆش و سەرنجڕاكێش دووبارەی دەكردەوە، خۆ ئەو نووسەر نەبوو، لە هەزاران یەكێك خوێندەواری نەبوو، بەڵام ئاقڵمەند بوو، لە ئێستاش بە جەستە ئێجگار ماندووتربوو بەڵام بە هزر ئاسوودە و بەختیارتر، دەبا هەریەكەمان ئەم چەند هەقایەتەی لەلایەن ئەم ئاقڵمەندانە دانراون كۆی بكەینەوە چونكە تەمەنیان چەند ساڵێك ماوە و بە رەگەوە لەناو دەچن چونكە هەقایەتخوان كۆتایی دێت و جێگری نەماوە.

**جەمال گردەسۆری ٢٩/٤/٢٠٠٧**

## ئەحمەد کەرتك

هەبوو نەبوو پیاوێك هەبوو دوو ژنی هەبوو، ژنێکیان دوو کوڕی هەبوو یەکیان ناوی محەمەد بوو ئەوی دیکەیان ناوی مەحموود بوو، ژنەکەی دیکە منداری نەدەبوو. رۆژێکیان هەردوو ژنەکەی نانیان دەکرد پیاوێکی پیریش لە دەرکەی دا و ژنە بێ مندارەکە چوو دەرکەی کردەوە و گۆتی فەرموو خارە چیت دەوێت؟ پیاوە پیرەکەش گۆتی: ئەگەر هەتانە خێرەکم پێ بکەن فەقیرم، ژنەکە گۆتی خێرت پێدەکەم ئەتووش دووعام لۆ بکە خوا مندارەکم بداتێ چونکە ئەوە چەند سارە مێردم بە پیاوی خۆم کردییە هیچ مندارم نابێت! پیاوە پیرەکەش گۆتی: ها کیژم ئەو سێوەت دەدەمێ هەتا سارێکی دیکەی ئەو وەختە ئەگەر مندارت نەبوو چیم پێ دەرێی پێم برێ، ژنەکەش دەرێ باشە خوا بکا وەبی، ژنەکە چەند نانێکی گەرم دەداتە پیاوە فەقیرەکە پیاوەکە دەڕوات ژنەکە سێوەکەی لەسەر بەرامبیلێ دادەنێت. جاشکێك لەولاوە دێت و قەمپارێکی لە سێوەکە دەدات دەبیات ژنەکە لەسەر نانی بە خێرایی دەیگاتێ کەرتەکی لێ دەستێنێتەوە، ژنە کەرتە سێوەکەی دەخوات سالێکی پێچوو و نەچوو کوڕێکی بوو ناویان لێنا ئەحمەد کەرتك. ئەو کوڕە گەورە بوو، بوو بە سوارچاکێکی زۆر چاك هەموو رۆژێ دەچووە راوێ بەدەست بەتالی نەدەهاتەوە نێچیرەکی لەگەر خۆی دەهیناوە، چ مامز یا بزنە کێوی بایە هەرچیەکی بایە. دوو برایەکەی دیکە واتە زڕبرایەکانی محەمەد و مەحموود هەموو رۆژێ هەر قشپلیان دەهێناوە. بابی دەیگۆت کوڕەکانم ئەمە لە هەوێزێ چ زۆرە قشپل زۆرە ئەنگۆ لۆ قشپلی دەهێننەوە. بابیان



ئەحمەدی خۆشتر دەویست لە دوو کوڕەکەی دیکەی، چونکە ئەحمەد کەرتك کوڕێکی زۆر ئازا و ئاقر بوو. رۆژێکیان محەمەد و مەحموود زۆر لە خۆیان بێزاربوون گۆتیان وا باشە ئەحمەدی بگرین بیهاوێینە ناو چالی قیڕێ. دەرێن تەگبیریان کرد وای لێ بکەن، رۆژەك ئەحمەد کەرتك لە راوێ دەهاتەوە توورەگەیەك زێڕی دەهێناوە لۆ داك و بابی، محەمەد و مەحموود بە هەردووکیان ئەحمەدیان گرت و ئاوای ناو چالە قیڕیان کرد، زێڕ و شتومەکەکانی، محەمەد و مەحموود بردیانە لای بابیان، بابیشیان کەیفی خۆش بوو، گۆتی کوڕم ئەوەکو ئەوڕۆ وەکو جاران قشپلیان نەهیناوە. ئەوانیش گۆتیان بابە لەوەتەی رۆژەکەی پێت گۆتین چیتر قشپل نەهیننەوە، چی دیکە قشپلمان نەهیناوە. دەرێ ئێوارە داهات رۆژ ئاوابوو بابی گۆتی کوڕم ئەحمەدتان نەدیوە، محەمەد و مەحموود گۆتیان نەخێر بابە، ئەمە نەمان دیتیە، ئەسپەکەی ئەحمەد کەرتك بە حیلەحیل هاتەوە لۆلای بابی، ئەسپەکە هەر دەنوزاوە لەلای بابی ئەحمەد کەرتك، بابیشی لەگەر ئەسپەکەی بە پەلە چوون، وەکی چوون دەبینی ئەحمەد کەرتك کەتیتە ناو چالی قیڕی. ئەحمەد کەرتك هاوار دەکات و دەرێ بابە مریشك و جوجکەی حەفت گوندان خڕ بکەنەوە لەگەڵ هەندێك گەنم بەسەر قیڕەکەی وەربکەن مریشك و جوجکەکانیش لەسەر قیڕەکەی دابنێن تاوەکو بچمە دەرەوە بابی ئەحمەد کەرتکی دەرهێنا لەناو قیڕەکەی لە پاش مانگێکی پێ چوو ئەحمەد کەرتك هەر لە مارەوە بوو، دوایێ گۆتی: بابە چی دیکە ناتوانم لە مارەوە بم دەچم لۆ راوێ بابی دەرێ کوڕم مەچوو هیچ بزنە کیوی و مامزمان ناوێت، نانێك هەر هەیە ئێمە پێی بژین، ئەحمەد کەرتك دەچی لۆ راوێ دەبینی مامزێك لەسەر شارە مێرووستانێك دەلەوەڕێت دەرێ دەیکوژم، پاسەوانێکیش لەوێ دانیشتبوو گۆتی: ئەم مامزە هی دێوی سپییە بزانێت کوشتیتە خوا بە خۆی بزانێت چیت لێ دەکات. ئەحمەد کەرتك دەرێ نا دەیکوژم پاسەوانەکە دەرێ کەیفی خۆتە ئەمن لۆ توومە. ئەحمەد کەرتك مامزەکە دەکوژێت دەیبات لە رێیێ دێوی سپی تووشی دەبێت. دەرێ بۆن دێت بۆنی بێگانان دێت لەو حەوشە و بانان دێت دێوەکە دەبینێت ئەحمەد کەرتك مامزەکەی کوشتیە و دەیبات.

ئەحمەد کەرتکی دەگرێت فڕەی دەداتە ناعورەکی هەر دەڕوات، هەر دەڕوات لەناکاو دەکەوتە جێگاییێك جێگایەکەش بنی دنیاییێیە. ئەحمەد کەرتك لە دەرگای مارێك دەدات زۆری تێنییە پیرەژنێك دێتە دەرەوە، دەرێت فەرموو کوڕم چیت دەوێت؟ ئەویش دەرێ داپیرە هەندێك ئاوم بدەرێ پیرەژنەکەش نایەوێت دری بشکێنێت دەچێت هەندێك میزی خۆی لۆ لەناو جامێك دەکات دەیداتێ، کە دەخوات دەرێ ئەرێ ئەو ئاوە لۆ ئەوەندە سوورە پیرێژنەکەش گۆتی: چیت لێ بشێرمەوە ئەوە میزی خۆمە لۆم تێکردووی، چونکە هیچ ئاومان نییە لۆ خواردنەوەش، لەبەر ئەوەی نەهەنگێك هەیە ناهێڵێت هیچ ئاومان لۆ بێت هەموو رۆژێکیش دەبێت کیژەکی چاردە ساری ببێت بە خواردنی ئەو نەهەنگە. ئەحمەد کەرتك گۆتی شیرێکم بدێ ئێستا لۆتان دەکوژم. پیرێژنەکەش گۆتی: کوڕم مەچوو دەتخوات، ئەحمەد کەرتك شیرەکەی لەسەری خۆی بەست چووە ناو کونی نەهەنگەکە کە چاوی پێکەت لە دووڕا هەڵی مژی لۆ ناو دەوی شیرەکەی لەسەر دەویڕا تا کلکی کەرتی کرد. نەهەنگەکەی کوشت ئاو لۆ مارەکان رۆیشت و ئەحمەد گەڕایەوە لای پیرێژن.

پیرێژنەکەش ئەحمەد کەرتکی برد لۆ لای پاشا، پاشا گۆتی ئەتوو نەهەنگەکەت کوشت؟ ئەحمەد گۆتی: بەرێ پاشا. پاشا گۆتی، بخوازە ماری دنیاییێ ئەحمەد کەرتك گۆتی، دەمەوێ بمگەییینیە سەر دنیاییێ، پاشا دووبارە لێی دووبارەکردەوە بخوازە ماری دنیاییێ، ئەحمەد هەر گۆتی دەمەوێ بمگەییینیە سەر دنیاییێ. پاشاکەش گۆتی: بەس ئەوەت نەگۆتبایە هەرچیت بگۆتبایە من ئامادەبووم، بەلاّم دەتنێرمە لای سیمرخی هەموو ساڵێك فەرخەی دەکات، ئەو نەهەنگە لێی دەخوات، بزانی ئەتوو نەهەنگەکەت کوشتیە لە خۆشیان خەنی دەبی، دەتگەیەنێتە سەر دنیاییێ، ئەحمەد کەرتکیان برد لۆ لای سیمرخی گۆتی: باشە دەتگەیەنمە سەر دنیاییێ بەلاّم حەوت نوردییە نانم بداتێ لەگەر حەوت کەلەشی مەڕەکی هەر بڕەك رۆیشتم پشکێکی گۆشتم باوێ ناو دەوم لەگەر نانەکی. ئەحمەد کەرتکیش دەچێتە لای پاشا پاشا هەمووی لۆ رێك دێخی، ئەحمەد سواری سەر پشتی سیمرخ دەبێت دەڕوات هەر بڕێك دەڕۆیشت،



پشکێك گۆشتی داوێتە ناو دەوی سیمرخەکەی لەگەر نانێك. هەر رۆیشت نێزیك بوونەوە لە دنیاییێ، ئەحمەدی گەیاندەوە سەر دنیاییێ و سیمرخەکە گەڕایەوە لای داك و بابی و بەیەکتر شادبوونەوە.

------------------------------------

※ ئەم هەقایەتەم لە زاری عەبدولکەریم ئەسعەد/ تۆمار کردووە و لەدایکبووی ١٩٦٦وە دانیشتووی شاری هەولێرە.

※ لە گۆڤاری ئاسۆی فۆلکلۆر ژمارە ١١ ساڵی ٢٠٠٥ بلاّوکراوەتەوە.

## بەهرەمی پاڵەوان

هەبوو نەبوو، کەس لە خودای گەورەتر نەبوو، دەگێڕنەوە لە سەردەمی زوو، شارێك هەبوو، گشت دانیشتووانی شار کافر بوون، تەنها مارێك نەبێ. ئیسلام بوون، خاوەنی یەك کوڕ بوون، کوڕەش، ناوی بەهرەم بوو، هەرچەندی برێی مندارەکی زیرەك و ئاقر و پارەوان و بەهێز بوو، بەهرەم ڕۆژێك چووە ناو مندااران بۆ یاری هەڵماتێن، بەڵام بەهرەم هەڵماتێکی گەورەی دروست کردبوو، لەگەریان دەستی کرد بە هەڵماتێن، بەهرەم هەڵماتەکەی بەتێن دەهاوێشت و لەسەری مندارەکانی دەدا و دەیکوشتن، مەبەستی بوو لەناویان ببات بە فێری یاری هەڵماتێن گەلەکی لێکوشتن، ئەم کارە دانیشتووانی شار و کەس و کاری مندارەکان پێیان زانی و کاری لێکردن بۆیە ڕۆژێك چەندەها کەس چوونە لای پاشای شارەکە و شکایەتیان لێکرد، کەوا ئەم مندارە واز لەم کارە بهێنێ و رزگارییان بێ، دانیشتووان نارەزاییان بە توندی دەربڕی لە بەرامبەر پاشا، گۆتیان پاشامان خۆشبـی ئەو ئیسلامەی لەناو ئێمە دەژی مندارەکی زۆر سەیری هەیە، لەگەر مندارەکانمان بەهۆی یاری دەیانکوژێ، پاشا لە دوای پاسەوانانی ناردوو پێی گۆتن هەر ئێستا دەبێ بچن باوکی بەهرەمم بۆ بانگ بکەن، پاسەوانان گۆتیان بەسەرچاو لێیان دا ڕۆیشتن لۆ دوای باوکی بەهرەم و هێنایانە کۆشکی پاشا، باوکی بەهرەم فەرمووی: پاشام خۆش بی خێر بوو بە دوای منت ناردبوو، پاشاش گوتی: باوکی بەهرەم دانیشتووانی شار لەلای من شکایەتیان لە بەهرەمی کوڕت کردووە گوایە دەچێتە ناو مندااران بە فێری یاری دەیانکوژێ، ئنجا ئەگەر لەمەودوا



لەو کارەی واز نەهێنی لەسەری دەدەم و دەیکوژم، باوکی بەهرەمی هەژاریش لە ترسانا فەرمووی: باشە گەورەم، لە پاشان گەڕایەوە مارەوە و بانگی بەهرەمی کوڕی کرد و فەرمووی کوڕم بەهرەم دانیشتووانی شار شکایەتیان لە تۆ کردووە کە گوایە منداری کافرەکان دەکوژی ئنجا ئەگەر بێ و واز لەم کارە نەهێنی پاشا لەسەرت دەدا و دەتکوژێ ئێمەش هیچمان پێ ناکرێ بەرامبەر پاشا لێت دەپاڕێمەوە بەهرەمیش گۆتی! باشە بابە چیتر ئەم کارە ناکەم. ماوەیەك دوورکەوتەوە و چیتر هەڵماتێنی نەکرد و وازی هێنا. ئەمجارە دەچووە ناو باغچەی داران و داری خوار دەکردەوە و منارە کافرەکانیشی دەهاوێشتە سەرو ئنجا سەری دارەکەی بەردەدا و منداارانی فڕێ دەدا خوارێ و دەیکوشتن بەم کارە فێر ببوو ماوەیەکی پێچوو چەندەهای لێ کوشتن. دیسان خەرکی شار و کەس و کاری مندارەکان بەم کارەیان زانی و زۆر بە ئازار کەوتن بەم کوڕە، ناچار دووبارە چوونەوە لای پاشا و شکایەتیان لە بەهرەم کرد کەوا ئەم کوڕە بەم کارەی فێر بووە و مندارەکانیان دەکوژێ، بەرامبەر پاشا راوەستان و گوتیان، پاشا بەهرەم منداری ئێمەی خەلاس کرد، پاشا فەرمووی: ئەم جارە فێرەکی دیتیتەوە، خەرکەکە گۆتیان! پاشا، مندارەکانمان دەهاوێتە سەر داران و دارەکەی خواردەکاتەوە و بەری دەدا مندارەکان لەسەر دارەکە دەپەڕن و بەردەبنەوە و دەمرن، پاشا فەرمانی دەرکرد و بانگی پاسەوانی کرد و گوتی، هەر ئێستا بڕۆن بەبێ وەستان بانگی باوکی بەهرەم بکەن بۆ ئێرە، پاسەوانەکان بە بێ یەك و دوو چوونە دوای باوکی بەهرەم و هێنایانە کۆشکی پاشا، پاشا گۆتی: باوکی بەهرەم ئەم جارە واز لەم کارە نەهێنی لەسەر تۆ و بەهرەم دەدەم. باوکی گۆتی: بەرێ پاشا، لە پاشان دا گەڕایەوە مارەوە و بانگی بەهرەمی کرد و گۆتی: بەهرەم کوڕم دیسان خەرکی شار شکایەتیان لە تۆ کردووە گوایە لەناو باغچە و رەزان مندااران دەکوژیت پاشا گۆتی: بەهرەم واز لەم کارە نەهێنێ لەسەری من و تۆ دەدا.

بەهرەم گوتی: باشە واز لەم کارە دەهێنم ماوەیەك لەم کارەش دوورکەوتەوە و وازی هێنا، ئەم جارە دەچووە ناو یاری گورج گورجانێ و گورجەکی گەورەی دروست

کردبوو یاری پێ دەکرد، بەڵام لە یاری کردندا گورجی رادەوەشاندە مندارەکان و لێی دەدان دەیکوشتن. بەم فێرەش چەندەها منداری دیکەی کوشت، ئەم کردارەش بڵاوبۆوە و خەرکی شار و کەسوکاری مندارەکان پێیان زانی دیسان وەك جارانی تر چەند کەسێك چوونە لای پاشا شکایەتیان لە بەهرەم کرد وتیان: پاشا مندارمان نەما بەرهەم هەمووی کوشت، پاشا گۆتی: چۆن؟! خەرکەکان گۆتیان: بەهۆی یاری گورج گورجانێ، بە گورجان لێیان دەدا و دەیانکوژێ، پاشا لە دوای پاسەوانی نارد و پاسەوانان هاتنە لای پاشا و پاشا گۆتی: پاسەوانان هەر ئێستا دەچینە ماری باوکی بەهرەم. پاسەوانان گۆتیان: بەسەرچاو، بێ یەك و دوو چوونە ماری باوکی بەهرەم. پاشا گۆتی باوکی بەهرەم: یا دەبێ بفرۆشییە من یان لەسەری هەردووکتان دەدەم. باوکی بەهرەم لە ترسان گوتی: دەیفرۆشم بە سەد پارچەی زێڕی.

پاشا گوتی: باشە، بە سەد پارچە زێڕ لێی کڕی. پاشا خۆی یەك کوڕی هەبوو ناو ئەحمەد بوو، لە بەرخوێندن بوو بەهرەمیش لەگەر کوڕەکەی خۆی لەبەر خوێندنی دانا. کوڕی پاشا و بەهرەم شەو و رۆژ لە ژوورێك دەیانخوێند، تاوەکو خوێندنیان کۆتایی پێ هات. دوایی پاشا بانگی هەردووکیانی کرد و یەك و سەد زێڕی دانێ. گۆتی: لۆ خۆتان بڕۆن بۆ بازار، هەردووکیان چوون لۆ بازاڕ، کوڕی پاشا پارەکەی بە کەلوپەلی بێ سوود و خۆراك دا و خواردی بەهرەمیش، پارەکەی بە ئەسپەکی زۆر باش دا و گەڕانەوە مارەوە. رۆژی دووەم دووبارە پاشا یەك و سەد زێڕی پێدان و چوونە ناو بازاڕ، کوڕی پاشا دیسان کەلوپەل و خواردنی بێ سوودی پێ کڕی و تەواوی کرد بەڵام بەهرەم بە پارەکەی زینەکی زۆر باشی پێ کڕی و گەڕانەوە مارەوە، رۆژی سێیەم دیسان پاشا سەد زێڕی دایە بەهرەم و سەد زێڕی دا بە کوڕەکەی دیسان بەیەکەوە چوون لۆ بازاڕ کوڕی پاشا زێڕەکەی بە کەلوپەلی بێ سوود دا و تا کۆتایی پێهێنا، بەڵام بەهرەم بە زێڕەکەی شیرەکی زۆر باشی پێ کڕی و گەڕانەوە مارەوە، پاشا بیری لە بەهرەم کردەوە و لە دری خۆیدا گۆتی: کوڕەکی چەند ژیرە، بە پارەکەی چەند شتی باشی پێ کڕی، بۆیە بانگی کوڕەکەی خۆی کرد و گۆتی: کوڕم ئەم سێ سەد زێڕەم



پێدای بەبێ سوود تەواوت کرد، بەهرەمیش بە شتی چەند باشی داوە. لە پاش یەك، دوو رۆژ بەهرەم بە پاشا و کوڕەکەی پاشای گۆت: من دەڕۆم، پاشا زۆر لە بەهرەمی دەپاڕێتەوە و دەرێ چی بڕێی لۆت دەکڕم بەڵام مەڕۆ چەند وا دەرێ بێ سوود دەبێ، بەهرەم بە گوێی ناکە، دەرێ هەر دەڕۆم. سواری ئەسپەکەی دەبێ و دەست دەداتە شیرەکەیی و لێی دەدا و دەڕوا، کوڕی پاشا دەکەوێتە دوایی و دەرێ: منیش دێم، بەهرەم پێیی دەرێ لەگەرم مەیێ، لەبەرئەوەی نەوەك شتێکم لێ بێ، ئەنگوستیلەی لەدەست بوو و لە دەستی کردەوە و گۆتییە کوڕی پاشا من ئەنگوستیلەی خۆم بە تۆ دەدەم، تۆش ئەنگوستیلەی خۆت بە من بدە کاتێ ئەنگوستیلەی من لەلای تۆ ژەنگی گرت، کەواتە من نەماوم. کاتێ ئەنگوستیلەی تۆش لەلای من ژەنگی گرت، کەواتە تۆ نەماوی، بەڵام بەبێ سوود بوو ئەم قسانە. کوڕی پاشا گۆتی بشمکوژی لەگەر تو هەر دێم. بەهرەم لەگەر خۆی بردی و رۆیی لە رێگا تووشی مێرگەکی زۆر خۆش بوو کاتی ئێوارەش بوو. بەهرەم گۆتییە، کوڕی پاشا با ئەمشەو لەو مێرگە بنووین. کوڕی پاشا گۆتی: باشە. لە سواری ئەسپ هاتنە خوارەوە و بەهرەم لە نزیك خۆیانەوە ئەسپەکەی بەستاوە و لەگەر کوڕی پاشا، دانیشتن تا چەند سەعاتێك دوای کوڕێ پاشا پاری داوە و لێی نووست، بەهرەم بە تەنیا مایەوە، هەندەی پێ نەچوو دێوێك هات و گۆتییە بەهرەم ها چ دەکەی لێرە پەرەمووچی بەردەستم، تەیر بەفرینیش ناوێرێ بە لای ئەم مێرگە دابێ ئەتو کو هاتی ئێستا لەت و پەتت دەکەم، دێوە چل و یەك دەستی هەبوو، بەهرەم هەستا پێوە و دەستی دایە شیرو گۆتی من بەهرەمم تۆ ناتوانی بەهرەم بکوژی، ئەی دێو دەست بدە شیرت. دێوە دەستی دایە شیر و دەستیان کرد بە شەڕەشیر دێوە شیرەکی راوەشاندە بەهرەمی بەڵام بەهرەم لە خۆی هەردا و پێیی نەکەوت شیر بە زەوی کەوت کردییە تۆزێك چاو چاوی نەدەدیت پاشان کە تۆزەکە نەما. بەهرەم شیرەکی راوەشاند و چل دەستی بڕی، تەنها یەك دەستی ماوە بە تاکە دەستەکەی دەستەکانی دیکەی خڕکردەوە و لێیدا رۆیی کەمێکی پێچوو گەڕاوە، بەهرەم تەماشای کرد هەر چل و یەك دەستی تەواوە، دێوە گۆتی: هەستە بەهرەم هەتا

کەل و پەلت بکەم، بەهرەم هەستا، دێوە شیرەکی راوەشاند دیسان بەهرەم لەخۆی هەردا و پێی نەکەوت، شیرە بە زەوی کەوت کردییە تۆزێك چاو چاوی نەدەدیت، لە پاشان تۆزەکە نەما بەهرەم شیرەکی راوەشاند چل دەستی بڕی و یەك دەستی ماوە، بە دەستەکەی هەر چل دەستی خڕکردەوە و رۆیی لێیدا رۆیی و بەڵام ئەمجارە بەهرەم بە دواییدا رۆیی گۆتی بزانم ئەم دەستانەی چۆن چا دەبێتەوە. لە دوورەوە دیتی چووە لای خانیەکی سێ قات گێی راگرت، دێوە گۆتییە کیژەك چل و یەك کەزی دەرمانم بدەرێ چل و یەك کەزی کیژەکی زۆر جوان بوو قۆدییەکی لۆ هاویشت دەرمانی لێدا و دەست چابۆوە گەڕاوە، بەڵام بەهرەم لە پێش ئەو گەڕایەوە دیسان دێوە هاتەوە و گۆتی: هەستە بەهرەم با لەت و پەتت بکەم، بەهرەم هەستا و دێوە شیرەکی راوەشاند، بەهرەم لە خۆی هەردا و پێی نەکەوت شیرەکە بە زەوی کەوت و کردییە تۆزێك چاو چاوی نەدەدیت لە پاش ئەوەی تۆزەکە نەما، بەهرەم شیرەکی راوەشاند چل دەستی بڕی و یەك دەستی ماوە، بە دەستەکەی چل دەستەکەی خڕکردەوە و رۆیی، بەڵام ئەمجارە بەهرەم بە پەلە بە پێش ئەو کەوت و چووە لای سێ قاتەکە گوتی: چل و یەك کەزی دەرمانەکەم بدەرێ، چل و یەك کەزیش دەرمانەکەی لۆ هاوێشت، بەهرەم گەڕایەوە شوێنی خۆی، دێوەش چووە لای خانی سێ قات و گۆتی: چل و یەك کەزی دەرمانەکەم بدەرێ، چل و یەك کەزیش گۆتی: ئەی ئێستا دەرمانەکەم پێ نەدای، دێوە گۆتی من نەبوویمە پاشان بیری کردەوە گۆتی هەبێ و نەبێ بەهرەمە بە درێکی غەمگین گەڕایەوە لای بەهرەم و گۆتی: بەهرەم دەرمانەکەم بدەرەوە، بەهرەم گۆتی: بەشەرت ئەگەر ببـی بە ئیسلام، دێوە گۆتییە بەهرەم شەرت بێ ببم بە ئیسلام، بەهرەم دەرمانەکەی دایەوە و دێوە بوو بە ئیسلام لەسەر دەستی بەهرەم. دێوە گۆتییە بەهرەم سبەی لەلای من داوەتی بەهرەم گۆتی: باشە، کوڕی پاشاش هەر نووستییە ئاگای لەم کارانە نەبوو. رۆژ دەبێتەوە و کوڕی پاشا لە خەو هەردەستێ و بەهرەم سەربردەی کارەکەی لۆ دەگێڕێتەوە، لە پاشان پێشی دەرێ ئەمڕۆ لەلای دێوە داوەتین، بەڵام دێوە چل و یەك دەستی هەیە لێی مەترسێ، کوڕی پاشا دەرێ باشە، رۆژ تەواو هەردێ و دێوە دێ و



دەنەڕێنێ، بەڵام کوڕی پاشا دەترسێ، واتە ئەحمەد بەڵام هەر لەگەر بەهرەم و دێوە رۆیشت و چوونە ماری دێوە، لەوێ دەبن دوو سێ رۆژی پێ دەچی دێوە چل و یەك کەزی دەداتە ئەحمەد و لە مارەوە دایاندەنێ بەڵام دێوە و بەهرەم هەموو رۆژ لەگەر یەك دەچن لۆ راو، ئەحمەد و چل و یەك کەزیش هەر لە مار دەبن، رۆژێك چل و یەك کەزی حەوت کلیلی دەداتە ئەحمەد و پێی دەرێ ئەم حەوت کلیلە هی ئەم حەوت دەرکەیە هەموو دەرکەکان بکەوە، بەڵام دەکەی حەوتەمین مەکەرەوە، هەموو دەرکەیەکی هەریەکە و جۆرە شتێکی تێدایە، ئەحمەد دەرێ: باشە دەچی دەرکەیەکی دەکاتەوە دەبینێ پڕە لە کەلەشە دێو، دەرکەیەکی تر دەکاتەوە دەبینێ پڕە لە زێڕ، دەرکەیەکی تر دەکاتەوە دەبینێ پڕە لە زیو، بەم جۆرە هەریەکەی جۆرە شتێکی تێدایە، دوو سێ رۆژی پێ دەچێ لە دری دەبێتە مەراق بۆ ئەوەی بۆچی پێی گۆت دەرکەی حەفتەمین مەکەوە، زۆر دەبێتە مەراقی، بە دزی دەچێ دەرکای حەفتەمین دەکاتەوە و سەیر دەکا، دەبینێ دێوەکی تێدایە، دێوەکە دەرێ: ئەحمەد چۆنی. بەڵام دێوە بە بزمار لە زەویدا بەستراوە، دێوە زۆر قسەی خۆش لەگەر ئەحمەد دەکا و لە پاشان دەرێ، بۆ نایە بەرەڵڵام بکەیت، ئەحمەد دەرێ باشە دێم دەرت دەهێنم دێوە دەرێ وا نابێ بڕۆ پێراوی چل و یەك کەزی بهێنە هەر کاتی کە پێراوەکە بە بزمارێك بکەوی بە خۆی دێتە دەرێ، ئەحمەد دەرێ باشە، دەڕوا و دەچێ پێراوی چل و یەك کەزی دەهێنی و دەگاتە دەرگەی حەفتەم چل و یەك کەزی دەبینی و هاوار دەکا و دەرێ: کوڕە ئەحمەد نەیکەی، بەڵام ئەحمەد بە گوێی ناکاو دەیکاتەوە، دێوە بەرەڵڵا دەبێ و پڕ دەداتە ئەحمەد و بە عاردی دا دەدا و چل و یەك کەزی دەهاوێتە سەرشانی و لێدەدا و دەڕوا و، ئەحمەدیش لەوێ لەخۆ دەچێ لەو کاتەیش بەهرەم و دێوەی چل و یەك دەست لە راو دەگەڕێنەوە و کە دەگەنە نزیك مار، دێوە دەنەڕێنێ دەیزانی ئەم کارە روویداوە بەهرەم گۆتی: چی بووە گۆتی هیچ، دیسان تۆزێکی تر نێزیکبۆوە دێوە نەڕاندی، بەهرەم گۆتی: چی بووە، دێوە گۆتی: هیچ نەبووە دەچینەوە مارێ دەبینین، لە پاشان کە گەیشتنە مارەوە دەبینن چل و یەك کەزی نەماوە، ئەحمەدیش بەبێ

هۆش کەوتووە، دێوە گۆتییە بەهرەم دەبێ بچی چل و یەك کەزی بهێنیەوە بە چل ڕۆژی تر ئەگەر لە پاش ئەو چل ڕۆژە نەیهێنیەوە ئەحمەدی دەکوژم، بەهرەم دەڕێ باشە، لێی دەدا و دەڕوات لە ڕێگا تووشی گوندێك دەبێ، دەبینێ حەفت کەس هەویری دەکەن، حەفت کەس دەیکەنە ئەنگوتك حەفت کەس نانی پێوەدەدەن، حەفت کەس لێی دەکەنەوە، بە حەفت کەس لە ناو دەوی کافرێك دەکەن، بەهرەم دەچێتە لایان و دەڕێ: ئای لەم کافرە، چۆن ئاوا دەتوانێ، ئەمیش دەڕێ: کوڕە ئەمن چمە لۆ باسی بەهرەمی ناکەی، چل و یەك دەستی کردۆتە ئیسلام، بەهرەم دەڕێ بەهرەمی ببینی چی لێ دەکەی، کابرا دەڕێ لە کونی دەرزی بێ دەچمە لای، چی برێ لۆی دەکەم، لەگەری دەچم، بەهرەم دەڕێ من بەهرەمم، کابرا دەڕێ لەگەرت دێم، بەهرەم دەڕێ مێ بەڵام بێ سوود دەبێ دەڕێ هەر دێم لەگەری دەچێ و دەڕۆن، ماوەیەکی دەڕۆن تووشی گوندێك دەبن لە گوندەکە کابرایەکی دەبینن لەناو ئاگرەکی زۆر گەورەیە بەبێ ئەوەی بسووتێ، بەهرەم دەچێتە لای دەڕێ چۆن ئاوا دەتوانی بەبێ ئەوەی بسووتێی، کابرا دەڕێ سەرمام دەبێ، بەڵام ئەمن چمە لۆ بەهرەمی نارێی چل و یەك دەستی کردۆتە ئیسلام، بەهرەم دەڕێ: بەهرەمی ببینی چی لێ دەکەی، کابرا دەڕێ دەچمە لای ئەگەر بەناو کونە دەرزیش بێ هەر دەچمە لای لەگەری دەچم، بەهرەم دەڕێ من بەهرەمم، کابرا دەڕێ بە ڕاست بەهرەم دەڕێ بە ڕاست کابرا لەناو ئاگرەکە دێتە دەڕێ و ماچی دەکا ئەرێ منیش لەگەرت دێم، بەهرەم دەڕێ مێ سەرمات دەبێ دەڕێ نا هەر دێم ئەویش لە گەری دەڕوا ماوەیەکی تر دەڕۆن تووشی گوندێکی تر دەبن، لە گوندەکە کابرایەکی دەبینن غار دەدا بە هۆی سووکی بەسەر گورە گەنم و جۆدا دەڕوا هەرسێکیان دەچنە لای و بەهرەم لە کابرا دەپرسێ دەڕێ چۆن ئاوا دەتوانی، کابرا دەڕێ ئەمە چییە، بۆ بەهرەمی نارێی چل و یەك دەستی کردیتە ئیسلام. بەهرەم دەڕێ: بەهرەمی ببینی چی لێ دەکەی کابرا دەڕێ دەچمە لای ئەگەر بەناو کونە دەرزیش بێ لەگەری دەچم و دەڕۆم. بەهرەم دەڕێ من بەهرەمم کابراش دەڕێ من لەگەرت دێم، بەهرەم دەڕێ مەیێ لەگەرم، کابرا دەڕێ بشمکوژی هەر



لەگەرت دێم، بەهرەم دەڕێ باشە وەرە، کابراش لەگەریان دەچێ و دەڕۆن دەبن بە چوارکەس، ماوەیەکی تر دەڕۆن تووشی گوندەکی تر دەبن، دەبینن لە گوندەکە کابرایەك هەیە سەر بە سەر بەرد بکا دەزانێ لە بن زەوی و لەسەر زەوی چ هەیە، هەر چوار دەچنە لای و، بەهرەم لە کابرا دەپرسێ ئەوە چۆن ئاوا دەزانی، کابرا دەڕێ ئەمە چییە بۆ باسی بەهرەمی ناکەی چل و یەك دەستی کردیتە ئیسلام، بەهرەم دەڕێ ئەگەر بەهرەمی ببینی چی لێ دەکەی، کابرا دەڕێ بەناو کونی دەرزیش بێ دەچمە لای و لەگەری دەچم و دەژیم، بەهرەم دەڕێ من بەهرەمم، کابراش بەهرەمی ماچ دەکا و دەڕێ لەگەرت دێم، بەهرەم زۆر لێی دەپاڕێتەوە دەڕێ مەیێ، بەڵام بێ سوود دەبێ کابرا دەڕێ هەر دێم بەگەری دەکەوی و دەڕۆن، لە ڕێگادا بەهرەم باسی خۆی لۆیان دەگێڕێتەوە چی بەسەرهاتییە و لۆ کوێ دەچێ. کابرای سەر بە بەرد دەڕێ ئەمە زۆر ئاسانە من بۆتی جێبەجێ دەکەم، کابرا سەر بە بەرد دەکاو کونەکی زۆر بچووك دەبینێ ئەم کونەش زۆر دەچێتە بن زەوی و چل و یەك کەزیش لەوێیە، کابرا هاوار دەکا و دەڕێ چل و یەك کەزی بەهرەم هاتۆتە دوات لۆ ئەوەی بتباتەوە ئنجا بۆ ماوەی سێ ڕۆژی تر روحی دێوە ببیوونەوە لە کوێیە بۆ ئەوەی بیکوژین و لەناوی بەرین، چل و یەك کەزیش دەڕێ باشە، لەم کاتیش دێوە چۆتە ڕاو، لە پاش ئەوەی بەهرەم و هەر پێنج کەسەکەی تر دەڕۆن، دێوەش ئێوارە لە ڕاو دێتەوە و چل و یەك کەزی خۆی عاجز دەکا، دێوە دەڕێ: لۆ عاجزی، چل و یەك کەزی دەڕێ: لەبەرئەوەی عاجزم چونکە نازانم روحت لەکێیە دێوە دەڕێ: روحم لەناو ئەم فانۆسەیە، چل و یەك کەزی فانۆسەکەی جوان دەڕازێنێتەوە وەك بووکەشووشە، دێوە پێدەکەنی و دەڕێ: روحم ئەوە نییە، چل و یەك کەزی فانۆسی فڕێ دەدا تووڕە دەبێ، شەوی دووەم دیسان چل و یەك کەزی خۆی عاجر دەکا، دێوە دەڕێ لۆ عاجزی، چل و یەك کەزی دەڕێ چونکە روحی تۆ نازانم لەکێیە لۆیە عاجزم، دێوە گۆتی: ڕۆحم لەناو ئەو جێگەیە چل و یەك کەزی جێگایەکەی جوان رازاندەوە. دێوە پێکەنی و گۆتی ڕۆحم لە ناوی نییە، چل و یەك کەزی تووڕە بوو و جێگایەکەی فڕێدا، لۆ شەوی سێیەم دیسان چل و یەك

کەزی خۆی عاجز دەکا، دێوە دەڕێ لۆ عاجزی، چل و یەك کەزی دەرێ روحت پێ نازانم لۆیە عاجزم، دێوە دەرێ عاجز مەبە دارێك هەیە هەرچەند برێی گەورەیە لە فلاّن شوێن دارەکە بەرازەکی لە ناوە، بەرازەکە چێرەکی، لەناوە، چێرەکە سەیەکی لەناوە، سەیەکە تاژییەکی لەناوە، تاژییەکە کێروشك لە ناوە، کێروشك تەیرەکی لە ناوە، تەیرەکە شووشەکی لە ناوە، شووشەکە کرمەکی لە ناوە، کرمەکە روحی منە شەو دەڕوا و رۆژ دەبێتەوە دێوە لۆ راو دەڕوا وەکو رۆژان سێ رۆژەش تەواو دەبێ و بەهرەم و هاورێیانی دەگەڕێنەوە، دووبارە کابرای سەر بە بەرد دەکا و هاوار دەکا دەرێ چل و یەك کەزی روحی دێوە لە کێیە، چل و یەك کەزی بۆی دەگێڕێتەوە و دەرێ لە فلاّن شوێنە، بەهرەم و هاوڕێکانی لێی دەدەن دەڕۆن لۆ لای دارەکە و دارەکەی دەشکێنن بەراز دێتە دەرێ، بەرازی دەکوژن و چێر دێتە دەرێ، چێری دەکوژن و سە دێتە دەرێ سەی دەکوژن تاژی دێتە دەرێ، تاژی دەکوژن و کێروشك دێتە دەرێ، کێروشکی دەکوژن و تەیرەك دێتە دەرێ تەیرەکەی دەکوژن و شووشە دێتە دەرێ، شووشەی دەشکێنن و کرمەی دەهێننە دەرێ و بەهرەم کرمەکەی لەسەر دەستی دادەنێ، دێوە دێتە لایان دەرێتە بەهرەمی چت دەوێ لۆت دەکەم تەنها مەمکوژە، بەهرەم دەرێ. بڕۆ چل و یەك کەزیم لۆ بهێنەوە، دێوە دەرێ بە سەرچاو زۆر ئاسانە هەر ئێستا، دێوە لێی دەدا دەڕوا و چل و یەك کەزی دەهێنێتەوە لۆ لای بەهرەم، لەگەر بەهرەم بە یەکتر شاد دەبن چل و یەك کەزی لە پاشان شەپەکی لە کرمەکەی دەدا و دێوەی دەکوژی، بەهرەم و هاوڕێکانی و چل و یەك کەزی دەگەڕێنەوە، دەگەنە نزیك ماران دەبینن خەرکی شارەکەی هەموو لەسەر خانینە تەماشا دەکەن بزانن هیچ تۆز دیار نییە چونکە ئەگەر ئەمڕۆ بەهرەم و چل و یەك کەزی نەهێنێتەوە، چل و یەك دەست ئەحمەدی دەکوشت، چونکە سی و نۆ رۆژ بوو یەك رۆژی مابوو دوای تۆزەکیان دیت خەرکەکە زۆر درخۆش بوون لەبەرئەوەی بە کوشتنی ئەحمەد پێیان ناخۆش بوو، کاتێ تۆزەکە نزیك بۆوە بەهرەم و چل و یەك کەزی و هاوڕێکانی بوون و گەیشتنەجێ، خەرکەکە زۆر دڵشاد بوون، لە پاش چەند



رۆژێکی پێچوو، بەهرەم خەونەکی دیت لە پاش ئەوەی رۆژهەڵات، بەهرەم گۆتییە چل و یەك دەست و من و ئەحمەد و چل و یەك کەزی دەڕۆین، چل و یەك دەست گۆتی: مەڕۆن، بەهرەم گۆتی: هەر دەڕۆین، چل و یەك دەست گۆتی: باشە ئەگەر هەر دەڕۆن ئەم داوە مووەی کلکی ماینەکەم دەتاندەمێ بیخەرە نێوان دوو بەردی چەرخ و لە یەکی بدە لەوێ حازر دەبم، ئەگەر هەر شتێکتان پێویستە لۆتان جێبەجێ دەکەم، بەهرەم گۆتی: باشە مووی کلکی ماینەکەی هاویشتە ناو کیسەی توتن و لێیاندا رۆیشتن و چوونە لای چیایەکە و بەهرەم چوو خەزینەکەی دەرهینا لە پاشان رۆیشتن چوونە شارێك خانووەکی زۆر خۆشیان دروست کرد، ناوبانگی خانوو دەرچوو تا گەیشتە ناو دیوەخانان و پاشای شار، رۆژێك پاشا سەیری خانووەکەی کرد سەری سوڕما لە جوانی خانووەکە لۆیە بڕیاری دا داوەتیان بکا، رۆژێك خزمەتکارێکی ناردە دوایان بێن لۆ ماری پاشا داوەت بن، بەهرەم و ئەحمەد و چل و یەك کەزیش چوون لۆ داوەتەکە، کاتێك پاشا چل و یەك کەزی دیت یەکسەر ئەشقی بوو، لە پاش نانخواردن بەهرەم و ئەحمەد و چل و یەك کەزی گەڕانەوە لۆ ماریێ، پاشاش هەموو خزمەتکارانی خردەکاتەوە دەرێ چارەکم لۆ بکەن، شێت بووم لۆ چل و یەك کەزی. دەبێ هەر لۆ من بێ، خزمەتکارێك دەرێ پاشام خۆشبێ ئەم کارە بە پیرەژنان دەکرێ، پاشاش بڕیاریدا هەموو پیرەژنان خربکەنەوە، خزمەتکاران هەموو پیرەژنانیان خرکردەوە، پاشا گۆتی: تەگبیرەکم لۆ بکەن. من ئەشقی چل و یەك کەزی بوومە، پیرەژنەك گۆتی: بەهرەمی بنێرە بچێ تەیری پەریزادەی قاقای چین لە بۆت بهێنێ بەهرەمیش پێی ناکرێ و دەکوژرێ چل و یەك کەزی لۆ خۆت دەمێنێ پاشا گۆتی: تەگبیرەکی زۆر باشە، پاشا لە دوای بەهرەمی دەنێرێ بەهرەم دێت، پاشا دەرێ بەهرەم دەبێ بچی تەیری پەریزادەی قاقای چینم لۆ بهێنی، بەهرەم دەرێ: باشە دەگەڕێتەمە مارەوە زۆر بە کزی، ئەحمەد و چل و یەك کەزی لێیان پرسی لۆ ئاوا عاجزی، بەهرەم گۆتی: پاشا ئەمری لەسەرم کرد بچم تەیری پەریزادە قاقای چینی لۆ بهێنم. شەو داهات و لێی نووست تا بەیانی، بەهرەم بەیانی زوو لە خەو هەردەستێ و سواری ماینەکەی دەبی و

لێیدەدا دەڕوا، لە پاش ڕۆیشتنی بەهرەم، پاشا خزمەتکاران دەنێرێ لۆ دوای چل و یەك كەزی لۆی بهێنن، خزمەتکاران دەچنە ماری بەهرەم و گەلەکی لە ئەحمەدی دەدەن چل و یەك كەزیش دەهێنن بەهرەمیش دەڕوا لە ڕێگا ئێوارەی بەسەر دادێ و لادەداتە سەر ڕووبارێك دادەنیشێ و گەلییەکی زۆر خۆش دەبێ، بەهرەم دەرێ ئەمشەوە لێرە دەبم کەمێك دادەنیشێ و دێوەك دێ چ دێوەك مەپرسە زۆر گەورە دەبێ، دەرێتە بەهرەمی پێشوولەی سەر دونیا چی دەکەی لێرە، ئێستا لەت و پەتت دەکەم، گۆشتت دەخەمە ژێر ددانم، بەهرەم هەستاو گۆتی: ئەی کافر چۆن دەتوانی؟ چووە لای و گۆتی بە چ دەکەی. بمكوژی بە چ بکەین گۆتیان بە زۆرانێ، دەستیان بە زۆرانێ کرد و یەکتریان هێنا و برد، ئارەقە وەك بارانی بەهاری لە لەشیان دەهاتە خوارێ هەمووو لەشیان ببووە قوڕ، هەتاکو بەیانی بەمجۆرە بوو، بەهرەم لە دری خۆیدا گۆتی: خودایە ئەگەر ئەجەلم بەو دێوەی هاتییە با لە عەردیم بدات بمكوژێ وە نا لە عەردی بدەم قوتار بم وا نوێژی بەیانیشم دەچێ وەك و نوێژی عیشاییێ، ئەمجارە بەهرەم بە توندی دێوەی هێنا و برد لە عەردیدا لەگەر لە عەرداندا قۆپچەی سینگی بۆوە و جووت مەمك هاتەدەرێ، بەهرەم شیری هەرکێشا و گۆتی: کەس خۆی وا لەبەر من ڕانەگرتووە، ئەمە کیژیشە وای لە من کرد، دەرێی بتکوژم، کیژە گۆتی مەمکوژە چەندەها کەسم کوشتووە، بەڵام من شەرتم کردووە، کێ ئەمن لە عەردی بدا، حەراری ئەوم ئێستا تۆ منت لە عەردی داوە حەراری تۆمە بەهرەم گۆتی: باشە. ئەم شەوی لەگەر یەکدا لەوێ نووستن تاکو بەیانی. بەهرەم بەیانی زوو لە خەو هەستا، خۆی شوشت و بەسەرهاتی لۆ کیژە گێڕاوە و، ئنجا گۆتی: تۆ لێرە بە ئەگەر بە سەلامەتی هاتمەوە دێمەوە لات دەڕۆین کیژە گۆتی: باشە، بەڵام ئاگاداری خۆت بە ئەم ڕێیە زۆر بە ترسە، بەهرەم گۆتی: باشە دوعابوونی خواست و لێیدا ڕۆیی تاکو ماوەیەك لە ڕێگادا دیسان کاتی عەسر بوو گەیشتە ڕووبارێك لە سواری ماین هاتە خوارێ و چووە سەر ڕووبارەکە دانیشت لۆ ئەوەی کەمێك ئیسراعەت بکات چەند چرکەیەکی پێچوو دیتی دێوەك لۆ لای هات بەڵام چ دێوەك دوو هەندەی دێوەکەی تر لە دوورەوە گۆتی:



ئەی پێشوولەی سەرزەمین چ دەکەی لێرە چۆن هاتییە سەر ئەم ڕووبارە، تەیر ناتوانێ بەسەریدا بفڕێ ئێستا دەتخەمە گۆشتی بن ددانم. بەهرەم هەستا و بە دەنگێکی گەورە و پارەوانانە گۆتی لەگەر کێتە ئەی کافر بزانم چۆن دەمخەیتە گۆشتی بن ددانت بە چی دەکەین، دێوە گۆتی: بە زۆرانێ. بەهرەم گۆتی: باشە، دەستیان کرد بە زۆرانێ یەکتریان هێنا و برد ئارەقەیان وەك بارانی بەهارێ لە لەشیان دەهاتە خوارێ هەتا نیوەی بەژنیان لە قوڕ هەراتبوو هەردووکیان زۆر، زۆر ماندوو ببووون لە خۆیان بێزار ببوون، بەهرەم لە دری خۆیدا گۆتی ئەی خودایە ئەگەر ئەجەلم بەم دێوەی هاتییە زوو لە عەردیم بدا و بمكوژێ دەنا لە عەردی بدەم ئەوە نوێژی عیشام چوو ئەم جارە بەهرەم بە توندی هێنای و بردی لە عاردی دا و شیری دەرهێنا، قۆپچەی سینگی بۆوە و جووت مەمك هاتەدەرێ، بەهرەم گۆتی: کەس ئاوای ماندوو نەکردووم دەتکوژم، کیژە گۆتی: مەمکوژە من چەند سارێکە هەر یەکێك بێرەدا هاتبێ زۆرانێم لەگەر کردییە و لە عەردیم دایە و کوشتیتم، بەڵام شەرتم کردووە کێ من لە عەردی بدا حەراری ئەوم ئێستا من مێرد بە تۆ دەکەم و حەراری تۆم، بەهرەم گۆتی: باشە. ئەمشەوی لەگەر کیژە بوو تاکو بەیانی، بەهرەم بەیانی زوو لە خەو هەستا و خۆی شوشت و بەسەرهاتی خۆی بۆ گێرایەوە لە پاشان گۆتی: دەبێ بڕۆم، کیژە گۆتی ڕێگا زۆر بە ترسە با ڕێگایەکت لۆ ببینمەوە بەهرەم گۆتی: فەرموو. کیژە گۆتی: ماوەیەکی تر دەڕۆی تووشی ئەشکەفتێك دەبی کابرایەکی ردێن سپی دەبی هەر نوێژی دەکا لا بدە لای و سەلامی لێبکە و لە پاشان لێی بپرسە ڕێگات بۆ دەدۆزێتەوە بەهرەم گۆتی: زۆر باشە تۆ لێرەبە ئەگەر نەکوژرام دێمەوە لات و دەتبەم لەگەر خۆم، بەهرەم ڕۆیی ماوەیەك تووشی ئەشکەفتێك بوو دیتی کابرای ئەختیار ردێن سپی نوێژی دەکرد لە نوێژی بۆوە و بەهرەم سەلامی لێکرد و لە تەنیشتی دانیشت پاش کەمێك بەسەرهاتی خۆی لۆ گێراوە و گۆتی دەمەوێ بچم تەیری پەریزادەی قاقای چین بهێنم، کابرای ردێن سپی گۆتی: زۆر زەحمەتە بەڵام چونکە سەلامت کرد من ڕێگایەکت بۆ دادەنێم، بەهرەم گۆتی: زۆر مەمنونت دەبم و سوپاست دەکەم، کابرا گۆتی ماوەیەکی تر بڕۆ

تووشی شارەك دەبی لە نزیك شارەكە تووشی شوان و گاوان و كەرەوان و حوشترەوان
دەبی ئەمانە هەمموو هی وانە كوڕی برام كەرەوانی وانە لەناو كەرەكان كەرەكی سپی
تێدایە خۆت بە كلكی كەرەكە وەبكە دەچیتە ماری برام لەوێ برێ مام ئەختیاری لای
ئەشكەفتەكە منی ناردووە لۆ ئێرە و برێ گۆتی ماری برامە لەوێ ڕێگایەكت بۆ
دەدۆزنەوە، بەهرەم گۆتی: زۆر باشە، زۆر درخۆش بوو و دوعابوونی خواست و لێیدا
ڕۆیی گەیشتە نزیك شار و تووشی شوان و گاوان و حوشترەوان و كەرەوان بوو و چووە
ناو كەرەوان و كەری سپی دیتەوە و خۆی بە كلكی كەرە سپی وەكرد و شەو چووە
ماری كەرەوانی برای مام ئەختیار، بەسەرهاتی خۆی لۆ گێڕایەوە و لۆچی هاتییە و
كێ ڕەوانی كردییە لە پاشان كابرا بەهرەمی دەباتە سەر خانی و پێی نیشان دەدا و
دەرێ ئەم سێ قاتە یێ ماری بابی پەریزادەی قاقای چینە، پەریزادە و تەیرەكەی لە
قاتی سەرەوەیە بەڵام من كراوەكم هەیە لەسەری بنێی كەس ناتبینێ، لە پاشان
نووستن و بەیانی زوو لە خەو هەردەستن كابرا كراوەكەی دەداتە بەهرەم و، بەهرەم
كراوەكەی لەسەری دەنێ و بەرەو كۆشك دەڕوا و دەچیتە لای كۆشكی سێ قات
دەبینێ چوار هەزار پاسەوان لە دەوری ئەم سێ قاتەیە، بەڵام كەس بەهرەمی نابینێ،
بەهرەم بە دیقەت سەیری كۆشك دەكا و دەبینێ پەنجەرەی سەرەوە كرایتەوە، بەهرەم
دەگەڕێتەوە دەزوو لەگەر خۆی دەبا و دەچێتەوە لای كۆشك بەتێن سەری دەزووەكە
دەهاوێ لە لۆ سەر پەنجەرەكە لەوێ گیر دەبێ و بە دەزووەكە بەسەردەكەوێ، بە
پەنجەرەكە دەچێتە ژوورێ، دەبینێ چ دەبینێ، كیژەكی دەبینێ نووستیە نە بخۆ و نە
بكەی، هەر سەیری ئەم جوانیەی بكەی، چ جوانەك، لە بەژنی، لە ڕوومەتی، لە
پرچی، هەركە دەیبینێ و ئەشقی دەبێ بۆیە بەهرەم یەكسەر ماچەكی لێدەكا، دوای
تەماشای ئەملا و ئەولای دەكا دەبینێ تەیرەكە و پشیلەیەك لە لایەتی لە پاشان بە
دەزییەكە دێتە خوارێ و دەگەڕێتەوە لۆ مارێ كابرا و بەسەرهاتەكەی دەگێڕێتەوە
دەرێ بەیانی دەیبەم. پەریزادەش لە پاشان لە خەو هەردەستێ و خۆی ڕێك دێخی
بەرامبەر نەینۆك، دەبینێ ڕوومەتی ماچ كراوە، كێ توانی بێتە ژووری من. لۆ بابی



دەگێڕێتەوە بابی پەریزادە یەكسەر هەر چل هەزار پاسەوانی خردەكاتەوە و هەندیان
لێدەدا لە پاشان هەموویان لە بەندیخانە دەكا و چل هەزار پاسەوانی تر دەهێنێتە
دەوری كۆشكی پەریزادە و لۆ بەیانیش بەهرەم لە ماری كابرا دوعابوونی یەكجاری
دەخوازێ و گەلەك مەمنوونی كابرا دەبێ و بەرەو كۆشكی سێ قات دێ و وەكو جاری
پێشوو كراوی لەسەری دەنێ و كەس نایبینێ، دەزوو هەردەدا لۆ پەنجەرەكە و گیر
دەبێ و پێی هەردەگەڕێ و بەسەردەكەوی و دەچێتە ژووری پەریزادە تەماشا دەكا
پەریزادە نوستووە یەكسەر پەریزادە و تەیرەكە و پشیلەكەی هەردەگرێ و بە دەزوو
دێتە خوارێ و سواری ماین دەبێ و شار بەجێ دێڵێ و لە ڕێگادا كلاوی لەسەری
دەكاتەوە و كەمێكی تر دەڕوا پەریزادە بەخەبەر دێ، دەبینێ لەسەر ماینەكییە سەری
سووڕدەمینێ چۆن ئاوا هاتییە تەماشای بەهرەم دەكا و دەرێ تووبی خوا پێم برێ چۆن
و بە چ جۆری توانیت من بهێنی، چونكە مێشوولە نەیتوانیووە بهێتە ژوورەكەم، بەڵام
لەبەرئەوەی كەوا تۆ هێندە زیرەكی من حەراری تۆم. بەهرەمیش كارەساتی لە
سەرەتاوە لە بۆی گێڕاوە، لە پاشان لایاندایە سەر ڕووبارێك دانیشتن و بەهرەم گۆتی
دەبێ تۆزێك بنووین، بەڵام پەریزادە گۆتی: بڕۆین لەبەرئەوەی بابم خاوەنی سەدەها
سەربازە نەوەك خوانەخواستە هێرشمان لۆ بهێنن و بمانكوژن، بەهرەم گۆتی:
بشمانكوژن دەبێ تۆزێك هەر بنووین، هەردووك بە جووت لەگەر یەك لێی دەنوون، لە
كۆشكی سێ قاتیش واتە ماری پەیزادە خزمەتكار بەیانی چێشتی لۆ پەریزادە
دەهێنی، دەبینێ پەریزادە نەماوە، زۆر غەمبار دەبێ و بە دری تەنگەوە بانگی باوكی
پەریزادە و خزمەتكاران دەكات و دەرێ پەریزادە نەماوە. بابی پەریزادە دێ و بڕیار
دەدا سەد هەزار سەرباز كۆببێتەو هێرش ببا، سەعاتەكی پێ ناچێ سەد هەزار سەرباز
كۆدەبێتەوە و هێرش دەبەن، بەهرەم و پەریزادەش لەگەر یەك هەر خەوتوون بەڵام
پەریزادە هۆشیار دەبێتەوە و دەبینێ، وەك جمجمە سوڵتانی سەرباز بەرامبەریان دێن،
ئەویش یەكسەر بانگی بەهرەمی دەكا و دەرێ با بڕۆین هێرش هات، بەهرەمیش
دەرێ تا هەندێكیان نەكوژم ناڕۆم، هەرچەند پەریزادە هاوار دەكا بێ سوود دەبێ،

هێرش دەگەنە نزیکیان و بەهرەمی پارەوان دەست دەکا بە شەڕ لەگەریان و سەدەهایان لێ دەکوژێ و ئنجا سواری ماین دەبن لەگەر پەیزادە و پشیلە و تەیرەکەی لێی دەدەن دەڕۆن و رزگار دەبێ و دەچنە لای دوو کیژەکە و ئەوانیش هەردەگرن و باس و خواسی یەکتر لۆ یەك دەگێڕنەوە، دەڕۆن چەند رۆژەکی پێدەچێ دەگاتەوە شار و دەچنەوە ماریێ واتە ماری بەهرەم کاتێ بەهرەم دەبینێ تەنها ئەحمەد لە مارەوە ماوە. بەهرەم لێی دەپرسێ دەرێ ئەحمەد کوا چل و یەك کەزی، ئەحمەد دەرێ برێم چی، چت لێ بشارمەوە لە پاش تۆ خزمەتکارانی پاشا گەلەکیان لە من دا و چل و یەك کەزیشیان لە بۆ پاشا برد، کاتی بەهرەم گوێی لەم قسە بوو زۆر پێی ناخۆشبوو. گۆتی: شەرت بێ لەناویان ببەم گوتییە ژنەکان خۆتان ئامادە بکەن لۆ شەڕ لەگەریان، ژنەکان هەرسێ خۆیان ئامادەکرد و خەبەریان دایە پاشا لۆ شەڕ ئامادەبن، پاشاش سەرباز و خزمەتکارانی خرکردەوە لۆ شەڕ، بوو بە شەڕ، چ شەڕەك، هەر بیگێڕییەوە لۆ ئازایی بەهرەم و ئەم سێ ژنە کەوا چەند پارەوانی بەهێز و زیرەك و بە توانا بوون، کارەکیان بە پاشا و خزمەتکار و سەربازی کرد وەك گەڵای پاییز دەکەوتن، لە ئەنجامدا ئەوەی دیل بوو دەرچوو ئەوی تریان هەموویان کوشت و چل و یەك کەزیان لۆ ئەحمەد هێناوە، پاش چەند رۆژەکی پێچوو بەهرەم گۆتی با بگەڕێینەوە لۆ شاری خۆمان واتە شاری باوکی ئەحمەد و باوکی بەهرەم، گۆتیان باشە، خۆیان ئامادەکرد و لێیاندا گەڕانەوە کاتێ گەیین بە شار کاتی ئێوارە بوو، بەهرەم مووی لە چەرخدا و چل و یەك دەست هات گۆتی: چتان دەوێ، بەهرەم گۆتی: خانووەکی زێڕمان دەوێ لە تەنیشت ماریێ پاشای، چل و یەك دەست گۆتی: باشە، خانووەکی زێڕی لۆ دروستکردن لە دونیا خانووەکی ئاوا نەبوو لە جوانیدا، شەو رۆیی و رۆژهەڵات و خەرك دیتیان خانووەکی زۆر جوان دروستکراوە، سەرسام بوون لە جوانی ئەم خانوە قسە هات و رۆیی گەیشتە ناو دیوەخانی پاشا و پاشا پێی زانی گۆتی: داوەتیان دەکەم یەك دوو رۆژی پێچوو، رۆژێك پاشا لە دوایان دەنێرێ بۆ داوەت ئەوانیش دەچن و لەوێ پاشا لەگەر ئەحمەد و بەهرەم یەکتر دەناسنەوە، بەڵام هەرکە پاشا چاوی بە



ژنانی بەهرەم دەکەوێ ئەشقیان دەبێ، لە پاش نانخواردن بەهرەم و ئەحمەد و چل و یەك کەزی و ژنەکانی بەهرەم دەگەڕێنەوە، پاشا چەندەها لە خزمەتکانی کۆدەکاتەوە و پێیان دەرێ چارەیەکم لۆ بکەن. شێت بووم لۆ ژنانی بەهرەم، دەبێ هەر بۆ من بن، خزمەتکارێکیان گۆتی: پاشام خۆش بی فێر لۆ ئەم کارانە بە پیرەژن دەکرێ، پاشا بڕیاری دەرکرد چەند پیرەژن لەم شارەیە خربکەنەوە، خزمەتکاران چوونە ناو شار و سەدەها پیرەژنیان خرکردەوە و هێنایانە کۆشکی پاشا، پاشا پێی گۆتن: کارێکی ئاوام هەیە دەبێ فیرەکم لۆ بدۆزنەوە ژنەکانی بەهرەم لە بۆ من بن، پیرەژنەك گۆتی: رۆژێك بەهرەمی داوەت بکەن و لە رێگاش چەندەها بیر لێ بدەن و سەری بیرەکان بە شتێکی سووك بگرن بەرکو لە کاتی لۆ ئێرە دێت بکەوێتە ناو بیرێك، پاشا دەرێ باشە، بە خزمەتکاران چەندەها بیر لێدەدا و لە پاشان، رۆژێك بەهرەمی داوەت دەکا و لە دوای دەنێرێ، کاتێ دێنە دوای بەهرەم لۆ داوەت، پەریزادە دەزانێ و پشیلەکەی لەگەر دەنێرێ و دەرێتە بەهرەم لە دوای پشیلەکە بڕۆ، بەهرەم گۆتی: باشە، لەگەر پشیلەکە رۆیین، بەڵام بەهرەم لە دوای پشیلەکە دەڕۆیی، تاوەکو چوونە ژووری نان خوارن، نانیان خوارد و گەڕانەوە دیسان پشیلەکە لە پێشەوە دەڕۆیی و بەهرەمیش لە دوای. پاشاش فێرەکەی بێ سوود دەرچوو سەرنەکەوت لۆیە بە پیرەژنەکەی گۆت فێرەکەت سەری نەگرت، ئەمجارە پیرەژنەکە گۆتی داوەتی بکەن، بەڵام ئەمجارە زەهری لە خوارنەکە بکەن، پاشا گۆتی: باشە بە خزمەتکاران چێشتیان ئامادەکرد و ناردییە دوای بەهرەم بێ بۆ داوەت دیسان پەریزادە پشیلەی لەگەر نارد و بە بەهرەمی گۆت: ئەگەر پشیلە نانی خوارد تۆش بخۆ ئەگەر نەیخوارد تۆش مەخۆ، بەهرەم گۆتی باشە ئنجا بەهرەم و پشیلە رۆین و چوونە ماری پاشا لۆ نان خواردن. بەڵام نانی پێش بەهرەم زەهری تێکرایە و بەهرەم و پشیلە لەگەر یەکدا دانیشتن پشیلە یەکسەر چێشتەکەی بۆن کرد و زانی زەهری تێدایە نەیخوارد، بەڵام بەهرەم دەستی لۆ برد نانەکە بخوا بەڵام پشیلەکە شەپەکی لەدەستیدا، بەهرەمیش نانەکەی داناوە و نەیخوارد، چەندی گۆتیان لۆ ناخۆی، بەهرەم گۆتی ناخۆم هەستا و هاتەوە مارەوە،

پاشاش زۆر درتەنگ بوو گۆتی بەمجۆرە ناگیرێ دەبێ فێرەکی ببینمەوە چەند رۆژێکی پێچوو دیسان لە دوای بەهرەمی نارد لۆ دیوەخان بەهرەمیش هاتە دیوەخان پاشا گۆتی بەهرەم هەموو دەزانین تۆ پارەوانێکی زیرەك و بەهێزی، بەڵام دەبێ بە کشتەکی تۆ بگیرێی بەهرەم گۆتی: ئەگەر هەردوو دەستم بە گوریس ببەستن. پاشا گۆتی گوریسی بێنن.

خزمەتکاران گوریسیان هێنا و هەردوو دەستیان بەستا، پاشا گۆتی: دەی بیکوژن، بەهرەم دەستی لێك جوولاند و گوریسی کردە دوو پارچە و گۆتی بە راستتە، پاشا گۆتی: بە گەمەمە سوحبەتت لەگەر دەکەم، ئەمجارە گۆتی: بەهرەم بە چی دەگیرێی، بەهرەم گۆتی، ئەگەر بێ و موو لە دەستم بکەن وبیرێسن هیچم پێ ناکرێ پاشا گۆتی: دەی مووی بێنن، خزمەتکاران موویان هێنا و لە دەستییان رێست و پاشا گۆتی: دەی بیکوژن بەهرەم دەستی جوولاند و کردی بە دوو پارچە و گۆتی بە راستتە، پاشا گۆتی: سوحبەت دەکەم، بە گەمەمە پاشا گۆتی: بەهرەم بە راست بە چی دەگیرێی، بەهرەم گۆتی: بە مووی کلکی بارگینی خۆم بە میزی بارگینەکە بکەی و لە دەستم ببەستن بەمجۆرە دەگیرێم پاشا خزمەتکارێ دەنێرێ لۆ دوای مووی کلکی بارگینەکە لە ماری بەهرەم، خزمەتکارەکە دەچێ و داوای مووی کلکی بارگینەکە دەکا و دەرێ بە میزی بکەن، پەریزادە دەزانێ و مووەکەی ناداتێ، دەرێ با بە خۆی بێ، خزمەتکارەکە دەگەرێتەوە دیوەخان و دەرێ پەریزادە پێی نەدام و گۆتی با بەهرەم بە خۆی بێ، بەهرەم دەرێ: برۆ پێی برێ با بتداتێ، خزمەتکارەکە دەچێتەوە ماری بەهرەم، پەریزادە وەکو جاری پێشوو دەرێ برێ بەهرەم بە خۆی بێ خزمەتکارەکە دیسان دەگەرێتەوە دیوەخان و دەرێ پێی نەدام، بەهرەم دەرێ برۆ پێی برێ ئەگەر بە خۆم بێم دەیهێنم و ئەویش دەکوژم. خزمەتکارەکە دەچێتەوە ماری بەهرەم و بە پەریزادە دەرێ بەهرەم گۆتی ئەگەر بە خۆم بێم دەیهێنم و ئەویش دەکوژم ئەوجارە پەریزادە سێ چوار مووی لە کلکی بارگینەکە دەکاتەوە و بە میزی بارگینەکەی دەکا و دەیداتێ. خزمەتکارەکە دەگەرێتەوە دیوەخان لەوێ لە دەستی بەهرەم دەبەستن و



پاشا دەرێ: دەی بیکوژن، بەهرەم هەرچەند هەوڵ دەدا ناتوانێ لە دەستی خۆی بکاتەوە چەند خزمەتکارێك لێی خردەبتەوە و هەردوو چاوی دەردەهێنن و دەیخەنە ناو سندووقێك و چاوەکانیشی لە پشتی سەری دادەنێن و فرێی دەدەنە ناو زێیەکی دەروا، لە پاش فرێدانی بەهرەم پاشا چەندان خزمەتکاری دەنێرێ و بە دوای ژنەکانی بەهرەم، بەڵام ژنەکان ناچن و دەست دەکەن بە شەر لەگەریان، بەهرەمیش چەند رۆژێك بەناو زێدا دەروا تا رۆژێك شوانێك لە دەم زێ دانیشتییە سندووقەکەی دەبینێ شوانە زۆر کەیف خۆش دەبێ، دەرێ هەبێ و نەبێ ئەم سندووقە پرە لە زێر، خۆی رووت دەکاتەوە، بەڵام مەلەوانی زۆر باش دەزانی یەکسەر خۆی دەهاوێتە ناو زێیێ و سندووقی دەگرێ و دەریدێنێ، لە پاشان دەیهاوێتە سەر پشتی کەرێ و لە کاتی گەرانەوە بە دزی لە شوێنێك دەیشارێتەوە، لۆ ئەوەی کەس پێ نەزانێ نەوەك لێی بستێنن، شوانە دەچێتە مارەوە و بە ژنەکەی دەرێ. سبەی ناچم لۆ بەر مەرێ، لۆ بەیانی زوو شوانە دەچێتەوە لای سندووق و دەیشکێنێ دەبینی زەلامەکی تێدایە و دەجوولێ و هەردوو چاوی هاتیتە دەرێ و لە پشت سەری دانرایە، لێی دەپرسی لۆ وات لێهاتووە، بەهرەم کارەساتی خۆی لۆ دەگێرێتەوە، لە پاشان دەرێ. ببە لۆ سەر کانییەکی کە دەوروبەری دارودرەخت بێ ئەگەر دەشتوانی هەموو رۆژێك خواردن و ئاوم لۆ بێنی، شوانە دەرێ بەسەرچاو، سندووقی هەردەگری دەیباتە سەر کانیەکی بە دار و درەخت لە بن سێبەری دارێك دایدەنێ، هەموو رۆژێك خواردن و ئاوی لۆ دێنێ، رۆژێك سێ پەری دێنە سەر دارەکە یەکیان دەرێ ئای بەهرەم چیت بەسەر هاتووە، ئەوی تریان دەرێ، دەیناسی، سێیەم دەرێ چۆن دەیناسی، هی یەکەم دەرێ چۆن پارەوانێك بوو بەڵام بە فێر وایان لێکرد بەهرەمیش گوێی لە قسەکانە سێیەمیان دەرێ: دەتوانم چای بکەمەوە، یەکەم و دووە دەرێن چۆن؟ سێیەم دەرێ ئەی بەهرەم ئەگەر ماوی و هۆشت هەیە و نەنووستی خەون نییە، چارەت دەکەم گێم لێ راگرە، بە گێم بکە چا دەبی، ئەگەر یەکێك بەلات داهات پێی برێ ئەم گیایەی لە بن سندووقەکەت شین بووە هەریکەنێ و لە شتێك باش بیکوتی و ئاوەکەی لە شوێن

چاوەکەت دابنێ و چاوەکەی بهاوێتە شوێن خۆی چاك دەبێتەوە. لە پاشان هەرسێکیان هەردەفڕن و دەڕۆن، تۆزێك لە پاش پەرییەکان شوانە دێتە لای خواردن و ئاوی لۆ دێنێ. بەهرەم خواردن و ئاوەکەی دەخوا و ئنجا قسەی پەرییەکان لۆ شوانە دەگێڕێتەوە. شوانە دەرێ بەسەرچاو لە بۆت دەکەم، هەندێك گیا لە بن سندووقەکە هەردەکەنی و دەیباتە مارەوە و دەیکوتێ و ئاوەکەی دێنێ و لە قووڵاییی چاوەکە دەدا چاوەکان دەهاوێتە شوێن خۆی چاك دەبێتەوە، هەردووکیان زۆر درخۆش دەبن، بەهرەم پڕ دەداتە شوانە و ماچی دەکا، شوانە دەرێ: بەهرەم هیچ کوڕم نییە تۆ ببە کوڕی من، بەهرەم دەرێ شوانە ناتوانم ببمە کوڕت دەبێ هەر بچمەوە لۆ شاری خۆم، لەوێ یەکتری ماچ دەکەن و بەهرەم دوعابوون دەخوازێ و دەگەڕێتەوە شاری خۆی، دەبینێ شەڕە لا دەداتە مارێك یەك پیرەژن دەبێ، بەهرەم یەکسەر لێی دەپرسێ پووری ئەم شەڕەی ئەو شارە لە پێناو چییە و لە بۆچی؟! پیرەژن دەست بە گریان دەکا و دەرێ کوڕم دیارە تۆ خەرکی ئەم شارە نیت، بەهرەم دەرێ نەخێر، پیرەژن دەرێ کوڕم کابرایەك هەبوو ناوی بەهرەم بوو، سێ ژنی هەبوو، پاشا حەزی لە ژنەکانی بەهرەم کرد، بەهرەمی کوشت و فڕێی دایە ناو زێ، ئنجا پاشا ناردییە دوای ژنەکانی بەهرەم و ژنەکانیش نەهاتن، ئنجا ئەوە شەڕی ئەم سێ ژنە و پاشایە، بەڵام ژنەکان خەرکی شارییان نەدەهێشت و کۆتاییان پێدەهێنا، پاشا چەندەها پارەوانی بە پارە گرتووە و کوژراون بەڵام سێ ژنەکە هەر ماون، بەهرەم دەرێ تۆ بڕۆ لای پاشا و برێ من کوڕەکم هەیە بە تەنها دەچێتە مەیدانێ و لۆ خۆت هەندەکی پارە وەرگرە پیرەژن دەرێ کوڕم دەکوژرێی، بەهرەم دەرێ قەیناکە، پیرەژن دەچێتە لای پاشا و پێی دەرێ پاشاش لە دوای دەنێرێ و رەوانی شەڕی دەکا و بەهرەم دەچێتە مەیدان لە ژنەکانیشی ژنەکی دەچێتە مەیدان و دەست دەکەن بە شیر وەشاندن ژنەکەی نازانی بەهرەمە، یەکتری دەهێنن و دەبەن ژنە شیر برند دەکا لە بەهرەمی بدە بەهرەم دەرێ نەکەی بەهرەمم شیرەکەی دەهێنیتە خوارێ و بەهرەم توالیتی برند دەکا و خاری ناوچەوانی بە ژنەکەی نیشان دەدا، ئنجا ژنە بڕوا دەکا بەهرەمە لادەداتە لای ماری پیرەژن، پاشاش درخۆش



دەبێ وا دەزانێ کوژرایە، رۆژی دووەم دیسان بەهرەم دەچێتە مەیدان و ژنەکەی تری دێتە مەیدان، زۆر بەقین و تووڕەیی وا دەزانێ ژنەکەی پێشوو کوژرایە، یەکتری دەهێنن و دەبەن و ژنە شیری برند دەکا لە بەهرەمی بدا، بەهرەم دەرێ نەکەی من بەهرەمم توالیتی برند دەکا و خاری نێوچەوانی پێ نیشان دەدا ژنەش بڕوا دەکا و بە یەکتر شاد دەبن و لا دەدەنە ماری پیرەژن، پاشا درخۆش دەبێ و چەندان پارچە زێڕی دەداتە پیرەژن، لۆ رۆژی سێیەم بەهرەم دەچێتە مەیدان و ژنی سێیەمیش دێتە مەیدان یەکتری دەهێنن و دەبەن و ژنە شیری برند دەکا لێی بدە بەهرەم دەرێ نەکەی بەهرەمم توالیتی برند دەکا خاری نێوچەوانی پێ نیشان دەدا و زۆر درخۆش دەبێ، لەگەر بەهرەم لادەدەنە ماری پیرەژن، پاشاش زۆر درخۆش دەبێ وا دەزانن هیچیان نەمان بەهرەم و سێ ژنەکەی لۆ بەیانی هەریەکە و سواری ئەسپی خۆی دەبێ و بە خەرکی شار رادەگەیەنن ئەوی دیل دەبێ باشە دەنا ئەوی تر با بێتە مەیدان بە هەزارەها دیل دەبن و لەگەر ئەوانی تریش دەست دەکەن بە شەڕ و پاشا و خزمەتکاران هەموویان لەناو دەبەن بەهرەم و ئەحمەد و چل و یەك کەزی و سێ ژنەکەش لەگەر یەکتر شاد دەبن، لە پاشان لەسەر قسەی خەرکی شار بەهرەمی دادەنێن بە پاشای شار.

## کۆتایی

-------------------------------------

❊ ئەم چیرۆکە ئەفسانەییەم لەسەر زای سەرهەنگ هاشم تۆمارکردووە.

❊ لە ساڵی ١٩٩٠ بە نامیلکە چاپکراوە

# پارەوانێک

هەبوو نەبوو کەس لە خوای گەورەتر نەبوو، کەس لە بەندەی درۆزن رووڕەشتر نەبوو ئاغایەك برازایەکی هەبوو، پارەوانی هۆزەکەیان بوو، یەك عەیبی هەبوو، هەر کەسەك تووڕەی بکردایە دەیکوشت.

رۆژەك مایینی ئاغەی دەزا کوڕە پارەوان داوای لە مامی کرد کە مایینەکە زا، جوانییەکەی بداتێ، مامیشی بە زمانی سوتای گۆتی: ناتدەمێ، کوڕەی پارەوان تووڕە بوو، لەسەر ئەو قسەیە مامی خۆی کوشت، دەرێن ئەو کات عادەت وابوو، ئەو کەسەی خزمی خۆی بکوشتایە، لە شەرمان دەڕۆیی و دووردەکەتەوە، لۆیێ ئەویش رۆیی و دوورکەتەوە و چووە دەشتاییەك و رەشماری لێهەڵدا.

پارەوان سێ کوڕ و کیژەکی هەبوو، پارەوان هەموو رۆژێ لەگەر کوڕەکانی دەچتە راوێ و داکە و کیژەش لە مارێ دەبن، ماوەکی پێدەچێ، دێوەك فێری داکە و کیژەی دەبێ، رۆژەك پارەوان دێتەوە مارێ جێ میزەك دەبینێ قۆرتە، لۆیێ شکەك دەکا، کە ئەو میزە هی ئەوان نییە لۆیە لە ژنەکەی دەپرسێ: ئەوە کێ لێرە میزی کردییە، ژنەکەش دەرێ: کیژەکەت، پارەوان بڕوای پێناکا، بەران بەسەر خۆشی نایێنێ، لۆ رۆژی دوایی وەکو جاران لەگەر کوڕەکانی دەچنە راوێ، کە هەریەکە و مایینی خۆیان هەبوو، کە دەبێتە نیوڕان، پارەوان بە کوڕە گچکەکەی دەرێ: هەرڕۆوە مارێ نانمان لۆ بینە، کوڕەکەش دەرێ: باشە، دەچتەوە مارێ هەر لەسەر پشتی مایینەکە دەرێ، دایە نانم بدەیێ هەتا زوو بگەڕێمەوە، داکی دەرێ دەوەرە خوارێ کوڕم.



کوڕەش دەرێ دایە درەنگە، داکەکەی دەرێ ئەگەر نەیە خوارێ هەردوو مەمکی خۆم دەبڕم، کوڕەش لەبەر ئەو قسەی داکی، دێتە خوارێ، هەر کە هاتە خوارێ و دێوە پڕی دەداتێ و دەیکوژێ.

پارەوان لەگەر کوڕەکانی هەر چاوەڕوانی نان دەکەن نانیان لۆ بێ، زۆری پێدەچی کوڕە هەر نایێ، لۆیە ئەو جارە پارەوان دەرێتە کوڕە ناوەنجییەکەی ئەتو برۆ گاسی براکەشت بکەوە و نانیشمان لۆ بینە، کوڕەی ناوەنجی دەڕوا، ئەویش هەر کە دەگاتەوە پێش دەرکەی مارێ، هەر لەسەر پشتی مایینەکە دەرێتە داکی کا براکەم، داکی دەرێ نانم دایێ و گەڕاوە کنتان ئەتوش وەرە خوارێ نانی بخۆ، کوڕەش دەرێ، نایەمە خوارێ دەگەڕێمەوە درەنگە داکی دەرێ ئەگەر نەیە خوارێ هەردوو مەمکی خۆم دەبڕم. ئەوجا کوڕە دێتە خوارێ و دێوە یەکسەر پڕی دەداتێ و دەیکوژێ.

پارەوان و کوڕە گەورەکەشی هەر چاوەڕوانی نان دەبن کە کوڕەکانی لۆیان ببەن ماوەکی زۆری پێ دەچی، ئەو جارە پارەوان دەرێتە کوڕە گەورەکەی کە بەتەنێ ئەوی لەکن مابوو، ئەتو برۆ بزانە براکانت لۆ نەهاتنەوە و نانیشم لۆ بینە، کوڕە دەرێ باشە. ملی رێ دەگرێ و دەگەڕێتەوە مارێ، هەر لە کن دەرکەی حەوشەی مارێ دەرێتە داکی کا براکانم، داکی دەرێ نانم دانێ و گەڕانەوە. ئەتۆش وەرە خوارێ نانی بخۆ کوڕەش دەرێ دەگەڕێمەوە درەنگە داکی دەرێ ئەگەر نەیە خوارێ هەردوو مەمکی خۆم دەبڕم، لەبەر ئەو قسەیە کوڕە دێتە خوارێ و دێوە یەکسەر پڕی دەداتێ و دەیکوژێ، پارەوانیش لەوێ هەر چاوەڕوانی کوڕەکان دەکا، تا ماوەکی زۆر ئەوجا ناچار دەبی خۆی دەگەڕێتەوە مارێ، ژنەکە هەر کە لە دوورەوە پیاوەکەی دیت گۆتییە دێوەی ئەوە پیاوەکەمە هاتەوە بیکوژە، دێوەش دەرێ نایکوژم بەس برینداری دەکەم با لۆ خۆی بمری، پارەوان گەیشتە جێ و گۆتیە ژنەکەی کا مندارەکانم ژنەکەش گۆتی: وا لە ژۆرێ دانیشتینە، هەر کە پارەوان هاتە خوارێ و دێوە پڕی دایێ و برینداری دەکا، ئەوجا لە پاشان فڕێی دەدەنە جێیەکی دوور، ژنە و کیژە و دێوە لە خۆشیان خەنی دەبن کە پارەوان و کوڕەکانیان لەکۆر بووەوە ئەوجا حەیوانێکی قەرەو لەناو

مێگەل دەگێڕتەوە و سەری دەبڕن و هەمووی دەهاوێنە ناو مەنجەرەك و لێی دەنێن و هەرسێکیان دەکەونە سەر گۆشت خواردن، هەتا تێر، تێر دەخۆن و ئەوجا دەکەونە کەیفی خۆیان، بەران شوانەکیان دەبی، شوانە بەو کارەساتە زۆر عاجز دەبی. لۆ رۆژی دوایی شوانە مەڕ رادەدا و دەچتە دەشتێ، لەبەرئەوەی بەرانەکە دەستەمۆ دەبی، دەبینی جیاواز دەبتەوە لە مەڕەکان و بە بۆن دەڕوا، شوانەش لەدووی دەچی، بەرانەکە دەگاتە کن پارەوانەکە ئەوجا رادەوەستی و هەر بۆنی دەکا، لە دوایی وی شوانەش دەگاتە کن پارەوان و دەبینی کرمی لێدایە، شوانە هەندەك ئاو و نانی دەداتێ و پارەوان بەسەرهاتی خۆی لۆ دەگێڕێتەوە، ئەوجا دەرێتە شوانەی فران گیا و فران گیا بکوتە و بیخە سەر برینەکەم. شوانەش دەچی گیایەکانی لۆ دەینی و دەیکوتی دەیخاتەسەر برینەکەی، برینەکەی چاك دەبیتەوە و ئەوجا دەرێ شوانە بە دزی شیرەکە و خەبەری مارێم لۆ بینە چ ئیش دەکەن هەریەکەیان.

شوانە دەرێ باشە. شوانە دەڕوا و لۆ سبەینێ دیسان نان و ئاو و شیری لۆ دەینی و بەسەرهاتی مارێ هەمووی لۆ دەگێڕێتەوە، ژنە نانی عازر دەکا و کیژە قاپ و قاچاغ دەشوا و دێوەش مەڕەکان ئاو دەدا و پارەوان دەرێ باشە، ئێوارێ، ئەمن لەسەر پشتی بەرانەکە ببەستەوە وەك خۆت دەزانی بەرانەکە لە لێوی بیرەکە نەبی ئاوی ناخوا واتە ئەوکات لە نێزیك دێوەکە دەبم، ئێوارێ دادێ و شوانە پارەوانی لەسەر پشتی بەرانەکە توند دەبەستی بەس دەستەکانی نەبێ، بەرەو مار دەگەڕێتەوە و مەڕەکان دەچنە سەر کۆل و بەرانەکەش دەچتە لێوی بیرەکە و لە نێزیك دێوە رادەوەستی پارەوانیش هەتا هێز و تاقەتی هەیە شیرەکەی رادەوەشێنێتە ملی دێوەکە و سەری دەپەڕێنی، دێوە لەوێ حەیاتی رەشی لێدەبڕێ، ئەوجا شوانە پارەوانەکەی دەکاتەوە و پارەوان دەچتە ژۆرێ و ژنە و کیژەی دەینی و هەردووکیان توند دەبەستێتەوە و پاشان ئاگرەکی گەورە دەکاتەوە ژنە و کیژەی دەهاوێتە ناو ئاگرەکە هەتا دەبنە رەژوو ئەوجا بەتەنێ دادەنیشێ و فکر دەکاتەوە و دەرێ ئەمن کاتی خۆی غەدرم لە مامم کرد لۆیێ ئاوام بەسەرهات، ئەوجا چوو شوانەی ماچ کرد و گۆتی قەت لە چاکەت



دەرناچم، دەرێ چەند رۆژەکی پێدەچی، تارانەك هەموو مەڕەکان لە شوانی بە تاران دەبەن شوانە زۆر بە عاجزی دەگەڕێتەوە کن پارەوانی، بەسەرهاتەکەی لۆ دەگێڕتەوە، پارەوان دەرێ هەر خەمیشی لێ مەخۆ دەبا هەر بیبەن. چەند رۆژەکی دیکە بەیەکەوە دەمێننەوە ئەوی هەیانبوو دەیخۆن ئەوجا پارەوان دەرێتە شوانەی وا باشە بڕۆین لۆ ئاوەدانییەکی هیچمان نەما تەنها ماینەکە و شیرەکە، ماوەکی دەڕۆن و تووشی گوندەکی دەبن، پارەوان دەرێتە شوانەی وا باشە ئەتوو لۆ خۆت لێرە ئیشەکی ببینیەوە، لێرەبە منیش دەڕۆم، شوانە و پارەوان گەردنی یەکتر ئازاد دەکەن و دوعابوونی یەکجارەکی لە یەکتر دەخوازن، شوانە دەمینێتەوە پارەوانیش دەڕوا، لە رێی ماینەکەی لێ دەتۆپی، شیر و زینەکەی لەسەر ملی خۆی دادەنێ و دەڕوا، هەندەی پێناچی لە دوورەوە رەشمارەك دەبینی هەریاندایە، شیرە و زینەی دەشارتەوە و روو لە رەشمارەکە دەکا و دەچتە ناو رەشمارەکە و سەلام دەکا و سەلامی لێی وەردەگرنەوە و دیوەخانەکی گەورە دەبی، چەند رۆژەکی پێدەچی، ئەوجا ئاغا گۆتی: ئەتوو کێی و لۆ چی هاتی، پارەوان گۆتی: کابرایەکی غەریب و بێکەسم دەمەوێ ئیشەکی بکەم، ئاغاش کە تەماشای کرد سەر و ردێن هەموو سپی، لۆیێ گۆتی: مامە ئەتوو کابرایەکی ئەختیار سەر و ردێن سپی وا بزانم تاقەتی ئیشت نەمایە، ئەتو لە مارێ برای خۆت بە و زەلامی گەورەمان نییە، سێ براین، هەموو رۆژێ دەچینە راو، هەندێ جار دوو سێ رۆژمان پێدەچی، خوشکەکمان هەیە بەتەنێ لە مارێ دەمینێتەوە ئەتو ئاگات لەوی بی و ئەتو خۆت ساحێب مار بە بەران حەزیش دەکەین ناوت بزانین، پارەوان گۆتی: ناوم مام غەریبە، ماوەی سارەکی پێدەچی، یەك رۆژ لە مام غەریبی عاجز نابن. لەبەر ئەوەی هەندە قسە خۆش دەبی، لۆیێ گەلەکیان خۆشدەویست بە تایبەت کیژەکەیان، جلکی جوانیان لۆ دەکڕی، خواردنی باشیان دەدایێ، مام غەریب بەتەمەن زۆر گەورە نەبوو، بەران لە خەمان سەر و ردێنی سپی بوو، لە پاش سارەکی لەگەریان، ئاغا لەگەر ئاغایەکی دیکە تووشی دەمەقاری دەبن و هەر لەو دەمەقارییە دەبتە شەڕەکی گەورە و گەرم، ئاغا ماری دەباتەوە گوندی و

خەرکی گوند هەر ئەوەی دەستی داری بگرتایە دەچووە شەڕ لە زەڵامی گوند بە تەنها مام غەریب دەماوە، کیژەش لۆ سوحبەتیێ دەیگۆتە مام غەریبی ئەدی ئەتو ناچی لۆ شەڕ هەر لەلای هێروە قسەیان لۆ بکەی وەك نەسیحەت و هاندانیان، مام غەریب دەیگۆت ناتوانم ئەختیارم، بە چ بڕۆم، یان دەیگۆتە کیژەی قاوەکم لۆ بکە دەچم، کیژەش قاوەی لۆ حازر دەکرد دەیهینا، مام غەریب دەیگۆت نە قاوەی دەخۆم نە دەچم لۆ شەڕ، بەران کیژە سوندی دەخوارد دەیگۆت دەبی هەر بیخۆی چونکە مام غەریبی زۆر خۆشدەویست، مام غەریبیش لەبەر دری ئەو دەیخوارد.

کیژەکەش دەیگۆت: ئەوە قاوەکەت خوارد دەبڕۆ، مام غەریبیش دەیگۆت: ناتوانم دوای ئەوە گۆتم دەچم بە چ بڕۆم بە پێیان، ماوەکی پێدەچی رۆژێ مام غەریب مایەنەکی دەبینی بەسترایتەوە، دەرێ ئەم مایەنە ئی کێیە، کیژە دەرێ: ئەو مایەنەی ئی بابی رەحمەتیمە، دەرێ ئەم مایەنەم پێ بدە دەچم لۆ شەڕ، کیژەش مایەنەکەی پێدەدا و مام غەریب لە پێش کیژەی پشتاوپشت بە نارێکی سواری مایەنەکە دەبی، کیژەش کە مام غەریبی بەو جۆرە دەبینی دەست بە پێکەنین دەکا، مام غەریب کە هەندەك دوورکەویتەوە، جوان سواری مایەنەکە دەبی و دەچتە کن شیرەکە و زینەکەی دەردەهینی دەڕوا لۆ شەڕ، هەر کە گەیشتە ناو شەڕێ شەڕەکی وا دەکا مەپرسە، دوژمنەکان لە ترسان هەموو دیل دەبن و مام غەریب چاوی یەکە یەکەیان دەبەستی و دەیانهێنیتەوە نێزیك ماریێ و زین و شیرەکەی دەشارتەوە و وەکو جاران پشتاوپشت و بە نارێکی سواری مایەنەکە دەبی، لە دوورەوە کیژەکەی دەبینی و دەرێ، ئەوە لۆ ئەو مایەنەت دامێ هەندەی نەمابوو بەربمەوە، کیژەش دەست بە پێکەنین دەکا و هەندەی پێ ناچی براکانی بەدرەکی خۆش دێنەوە ماریێ و دەرێنە خوشکەکەیان هیچ سوار مایەنت نەدیت، کیژەش دەرێ نە دوای دەرێ وەرن گێم لێبگرن بەسەرهاتی مام غەریبیان لۆ دەگێڕتەوە براکانیشی دەرێن ئەرێ کا مام غەریب کیژەش دەرێ نووستییە، برایەکان دەرێنە خوشکەکەیان سوارەك هات و شەڕەکی ئاوای کرد، هەموو دوژمنەکانمان لە ترسان دیل بوون، بەران مایەنەکە زۆر بە مایەنی بابم دەچوو، لۆ دوو



دری چوونە کن مایەنەکەی دەبینن هەموو قەلبی ئارەقەیە، ئەو جا دەکەونە شك کە مام غەریب بووە، لۆ درنیایی خەرکی گوندی هەموو خڕدەکەنەوە و هەموویان دەرێن وەڵڵاهی هەبی و نەبی هەر مام غەریبە، مام غەریبیش ئاگای لەو بەسەرهاتە نییە، لۆ خۆی نووستییە، دەچن هەریدەستێنن و دەرێن مام غەریب ئەتوو بووی، مام غەریب دەرێ ئەمن نەبووم، ئاغا دەرێ هەرچی ئەو ئازایەتییەی کردییە هەرچی پێ بدەین حەراریەتی، خەرکەکەش دەرێن بەخوا قابیلیەتی.

ئاغا دەرێ باشترین حەل ئەوەیە کە خوشکەکەمی پێدەدەم و دەیکەم بە ئاغا لەجێی خۆم، ئەوجا بەهەر جۆرەك بی مام غەریب خۆی ئاشکرا دەکا و دەرێتە ئاغای ئەمن ئاغایەتیم ناوێ و هەروا خوشکیشت جاحێرە و بەمن رازی نابی بەران کە پرس بە کیژە دەکەن، دەرێ ئەمن رازیم، لەبەرئەوەی چونکە ئەوەندە ئازا بووە، کیژە مێرد بە مام غەریب دەکا و ئەوجا مام غەریب دەرێتە کوڕەکان ئەنگۆ کوڕی کێنە، ئاغاش دەرێ کوڕی فلان کەسین، مام غەریب لۆی ئاشکرا دەبی کە ئامۆزای خۆیتی، بەران دەنگێ ناکە، هەروا ئاغا دەرێ لەو کاتەی کە ئامۆزایەکمان بابمی کوشت ئەو مایەنە کەس سواری پشتی نەبووە، سارەکی پێدەچی کوڕەکیان دەبی، بەران ئاغە دەرێتە خوشکەکەی بیدە بە من و لەکن مام غەریب برێ مرد، خوشکەکەی دەرێ، باشە بەمجۆرە سێ سار لەسەریەك کوڕیان دەبێ و دەرێتە مام غەریبی مرد، بەران ئاغا بە دزی بەخێویان دەکا، مام غەریب خەم ناخوا دەرێ خۆ ئەو مندارانەشم لە مندارەکانی دیکەم باشتر نەدەبوون، (١٠) ساری پێ دەچی مام غەریب زۆر ئەختیار دەبی زۆر فکر دەکاتەوە دەرێ وا باشە ئێرە بەجێبهێڵم و بچمە لای قەبری مندارەکانم با هەر لەوێ بمرم لۆ ئەوەی لە تەنیشت مندارەکان بمنێژن، چەند رۆژەکی پێدەچێ دەرێتە ئاغای ئەمن دەڕۆم بەران پێش رۆیشتن هەموو خەرکەکە دەعوەت دەکەم، ئاغا چەندی پێدەرێ حەز ناکەم بڕۆی، بەران مام غەریب ناسەلمێنی و دەرێ هەر دەڕۆم، لۆ سبەینێ خەرکی گوند دەعوەت دەکا و لە ئاخری کە لە نان خواردن دەبنەوە، مام غەریب دەرێ خەرکینە گەردنم ئازا بکەن و گەردنتان ئازا بی ئەمن دەڕۆم، دوعا بوون دەخوازی.

ئاغا مارەکی باشی دەداتێ و ئەوجا بەڕێی دەکا، کوڕەکانی هەرسێکیان پارەوانی زۆر ئازا دەبن، ئاغا لۆ تاقیکردنەوە گاسی کوڕەکان دەکا و پێیان دەرێ کابرایەکی ئەختیار لە فران رێ دەڕوا، مارەکی زۆری پێیە دەمەوێ مارەکەی لێستێنن، کوڕەکان دەرێن باشە، ئاغا دەرێ بەران بەشەر کوڕەکان دەرێن باشە، هەرسێ کوڕەکان دەچنە پێشی و پێیدەرێن مام ئەختیار ئەو هەموو مارەی کێوە دەبەی، مام غەریبیش دەرێ دەڕۆمە دوور کوڕەکان دەرێن ئەو مارەمان دەوێ، مام غەریب دەرێ ها هەمووتان بدەمێ، کوڕەکان دەرێن بە شەڕ نەبی نامانەوێ، مام غەریب دەرێ ئەمنەکی ئەختیار تاقەتی شەڕم نییە، کوڕەکان دەرێن ئەتوو ئازای ئەگەر ئازا نەبی بەتەنێ نارۆی هەروا دەرێن ئێمە یەك، یەك شەڕ دەکەین لەگەرت، ئاغا و خوشکەکەی لە دوورەوە خۆیان مات کردیە و ئاگاداری ئەو سەین و بەینەن، مام غەریب دەرێ لێمگەڕێن با بڕۆم، کوڕە گچکەکە پری دەداتێ و دەرێ ئەمن دەتکوژم داکەکە لە دوورەوە دێ و هاوار دەکا و دەرێ نەکەی وەك باوکتە، کوڕە دەستی ساردبوو، کوڕی ناوەنجی دەرێ ئەمن دەیکوژم، داکەکەی دەرێ نەکەی وەك بابتە، ئەویش دەستی سارد دەبی، کوڕی گەورە دەرێ ئەمن دەیکوژم، داکەکە دیسان دەرێ نەکەی وەك بابتە، کوڕە دەرێ، بابی چی، من بابم نییە، مام غەریب زۆر تووڕە دەبی لۆیێ توند دەیگرێ و دەرێ دەبی وەك بەرخ سەرت ببڕم، شیری لەسەر ملی دادەنێ ژنەکە دەرێ نەیکوژی دنیای نەدیتییە، مام غەریب دەرێ ئەگەر کوڕەکانم بمابایە بەقەدەنگۆ دەبوون، ئەرحان ئەنگۆ نەتاندەتوانی ئەو دەردەی بدەنە من، کە ئاغا خۆی حەشارداوە لە دوورەوە گێی لەو قسەیە بوو خۆی پێنەگیرا و هاتە کنیان و گۆتییە مام غەریبی ئەو سێ کوڕە کوڕی توون و کاتی خۆی بە ئەنقەست گۆتمان مردینە مام غەریب زۆر مەمنوونی خودای گەورەم کە کوڕەکانم ماون و پارەوانی ئازان، مندارەکانیش دەست بە گریان دەکەن و دەرێن بابە دەبی بمان بووری ئەتومان نەناسی کە حەزیەتماندای، ئەوجا هەموویان دەگەڕێنەوە گوندی و مام غەریب هەموو خەرکی گوندەکە دەعوەت دەکا و لەناو هەموو خەرکەکە دەرێ، خەرکینە من ناوم مام غەریب نییە و من فلان کەسم و



بەسەرهاتی خۆی هەموو دەگێڕتەوە کە کاتی خۆی مامی خۆی کوشتییە هەتا سەری، کوڕەکانی مامی لێیدەبوورن و دەرێن هەر توو دەبی ببی بە ئاغا، ئەوجا مام غەریب دەبتە ئاغا و بە درەکی خۆش لەگەر یەك شاد دەبن.

ئەمنیش کراشم دڕا و چم پێنەبڕا.

-----------------------------------

* لەسەر زاری محەمەد خدر تۆمارکراوە.

* لە گۆڤاری کەلەپووری کورد ژمارە ١٩ زستانی ٢٠٠٥ بلاوم کردۆتەوە.

# پاشای کۆرە

هەبوو نەبوو کابرایەك هەبوو ناوی ئەحمەد بوو، زۆر فەقیر بوو لە مار، رۆژەك چووە لای مامی داوای لە مامی کرد کیژەکەی بداتێ، ئەویش گۆتی: کوڕم ئەتو چت هەیە، گۆتی: ناوەڵڵا مامە هیچم نییە، گۆتی: کوڕم سەد روپیەی بینە، کیژەکەت دەدەمێ، گۆتی: باشە، کە گەڕاوە مارێ، گۆتی: دەڕۆم هەتا سەد روپیەی نەینمەوە نایەمەوە رووی کردە بەریایێ چەند رۆژ و چەند شەوان رۆیی گەیشتە شارەکی پرسیاری لە خەرکەکە کرد گۆتی: کاکە ئێرە کێندەرێیە، گۆتیان کاکە ئەوە شاری یەمەنە دەرێ گەڕا و سوڕا لەناو شار و جادان تەماشای کرد کابرایەك دانیشتییە کۆرەیە، هاوار دەکا دەپاڕێتەوە دەرێ ئەوەی دەرهەمەکم بداتێ خوا دە دەرهەمی دەداتێ ئەویش گۆتی: با دەرهەمەکی بدەمێ دەرهەمەکی دایێ ئەگەر دوو دەرهەمم بدەیێ خوا بیست دەرهەمت دەداتێ بەو فێرانە کابرا ئەو پارەیەی پێی بوو دایە کۆرەی پارەی پێ نەما چووە کن کۆرەی گۆتی: کۆرە پارەکانم بدەوە، دەنا ئێستا هەموو قەلبت دەشکێنم، کۆرە هاواری کرد کوڕە وەرن خەرکینە ئەو کابرایە غەدرم لێدەکات عالەم دەورەی لێدان گۆتیان کوڕە کابرا ئەتو چ هەقت لە کۆرەیە، کابرا گۆتی باشە کۆرە با لۆت بمینێ، ئێوارێ تاقیبی کۆرەی کرد، هەتا کۆرە هەستا بگەڕێتەوە ماری خۆی، کۆرە گەڕاوە هات لۆ مارێ، دوور و نزیك لە دوای هات هەتا گەیشتەوە مارێ لە کن دەرکەی راوەستا خەریکبوو کلیلەکانی دەرینی، کابرا بە زانایی گۆپارەکەی کۆرەی هەرگرت هینایە ئەولای دەرکەکە داینا، کۆرە ئەوهای کرد



گۆپارەکەی نەمایە گەڕا گۆپارەکەی دیتەوە کابرا پێش وی چووە ژۆرێ، کۆرە دانیشت فکری کرد ئەو گۆپارەی من لەلای راستم دانابوو لۆ هاتە لای چەپە، شکی کرد یەکی لە گەرە، کۆرە هەستا نانی بینی گۆتی ئێستا نانی دەخۆم نانەکەی بە حساب دەخۆم، ئەگەر نانەکەش خورا مەعنای وایە یەکەك لەگەرە من لە ژۆرێیە، نانی هینا دانیشت دەستی بە نان خواردن کرد، کابراش برسیتی سەبرۆکە دەستی بە نان خواردن کرد، کۆرە هەر ئەوەندەی زانیی نان خەلاس بوو، کۆرە گۆتی: کاکە ئەوە کێیە لە ژۆرێ لەگەرە من، کاکە ئەمن مێوانی راناگرم ئەمن کۆرەمە کەسم نییە، کابراش گۆتی: کۆرە ئەمن مێوان نیمە، ئەمن ئەو کابرایەمە کە پارەکەت بە فێران لە من ستاند ئەوجا خۆت کو خەلاس دەکەی خۆ کەسمان لە کن نییە هاوارکەی، هەر هاوارکەی دەتکوژم، کۆرە گۆتی کاکە لۆ دەمکوژی، ئەتوو دەرێی خەرکی ئەو شارەنی، کابرا گۆتی: نەخێر خەرکی ئەو شارە نیمە، کۆرە گۆتی: باشە لۆ هاتیە ئەو شارەی، گۆتی وڵڵا ئەمن مامەکم هەیە داوای کیژەکەم لێکرد، کیژەکەی دایمێ داوای سەد روپیەم لێ دەکات، ئەمنیش سەد روپیەم نەبوو، گۆتم با بڕۆم هەتا سەت روپیەی پەیانەکەم نایەمەوە، هاتم توشم بە توشی توو بوو، کۆرە گۆتی باشە ئەوجا سەت روپیە چیە وەرە ئیشەکم هەیە لۆم بکە ئەمن پێنج سەت روپیەت دەدەمێ، ئیش بە توو ناکرێ ئەتوو منداری ئیشت نەکردییە فێرە ئیش نی، ئیشەکەی من زۆر زۆر ئاسانە پارەت دەدەمێ مەسرەفی خۆت بکە بە کەیفی خۆت چوون و هاتنەوەت، ئەویش تەماشای کرد پێنج سەت روپیە گەلەك زۆرە، کابرا گۆتی کۆرە ئیشەکەت برێ، گۆتی پرسیارەکم هەیە وەڵامی پرسیارەکەم لۆ بینەوە پارەت وەرگرە وە ئیمکانە زیاتریشت بدەمێ، کابرا گۆتی کۆرە برێ، کۆرە گۆتی چایەچییەك هەیە لە شاری مسر ناوی یوسف پاشایە، چایخانەکی داوێتە ناو روبارێ سبەینێ دێتەوە تاخمەی چایخانەکەی وەکی خویتی هەڕو بزانە ئەوە لۆ وەدەکا، کابرا گۆتی باشە، سبەینێ کابرا لێیدا رۆیی ئەوجا بزانە بە چەند رۆژ و شەو گەیشتە شاری مسر کە شاری مسر گەڕا و سوڕا لە کابرایەکی پرسی گۆتی کاکە چایخانەی یوسف پاشای لە کێندەرێیە، گۆتی کاکە ئەو

چایخانە هەوە، کابرا چوو لە چایخانەکە دانیشت چایچییەکە چایەکی لۆ هێنا دانیشت نەڕۆیی هەتا مەلای مەغریبی چایەچییەکە گۆتی کاکە تۆ ناڕۆی، درەنگە من پێوە دەدەم دەڕۆم لۆ ماریێ خۆم، کابرا گۆتی وەڵڵا کاکە ئەمن لەو شارەی کەس ناناسم دەبی لەگەر خۆتم ببەیەوە ماریێ خۆتان چایەچییەکە گۆتی باشە دەتبەمەوە ماریێ بەشەرتەکی، کابرا گۆتی فەرموو بریێ چایەچییەکە گۆتی شەویێ لەکنە من کو نووستی هەتا سبەینیێ نابی بجولێی لۆ لایەکی دی، کابرا گۆتی بەریێ باشە، یوسف پاشا هەستا تاخمەی چایەخانەکەی لە پێش چاوی کابرا هەمووی هاوێشتە ناو روباری نیل، هاتنەوە ماریێ، کابرا تەماشای کرد کەس لە ماریێ نییە ئیللا ئەو کابرایە نەبی نانیان خوارد و دانیشتن پێکەوە دەستیان بە قسان کرد، کابرای مێوان گۆتی کاکەی چایەچی کە ناوت یوسف پاشایە دەزانی ئەمن لۆ مێوانی توو بوویمە، گۆتی فەرموو کاکە گیان، گۆتی لۆ ئەم تاخمەی چایەخانەکەت هەمووت هاوێشتە ناو رووباری نیل بەیانی چی دەکەی کێ لۆت دەینیتەوە، گۆتی مێوان ئەو قسەیە قسەی خۆت نییە وازبینە دەردی من و کۆرەی یەمەنیێ بە توو چاك نابی، مێوان گۆتی وەڵڵا ئەو سەرەی هینایتم نایگێڕمەوە لەناو دەچم یان چارەی دەکەم، یوسف پاشا گۆتی کاکەی مێوان من بەسەرهاتی خۆمت لۆ دەگێڕمەوە بە شەرتەکی من پرسیارەکم هەیە دەبی وەڵامی ئەم پرسیارەم لۆ بینیەوە، مێوان گۆتی بە چاوان بریێ، گۆتی کاکە من کوڕە پاشا بووم لەم شارە حەمامەك هەیە لەو شارە دەیانگۆت ئەوی بچیتە ئەم حەمامە رەنگی دەگۆڕیێ قسەی دەگۆڕیێ منیش باوەڕم نەدەکرد رۆژەك گۆتم با بچمە ئەم حەمامەی وەڵڵا چووم تەماشام کرد حەمامەکە ئەوەی بەشەربی لێنییە بەس تەنها من نەبی منیش دانیشتم بە کەیفی خۆم، خۆم شوشت خۆم لەبەرکرد بچمە دەریێ کیژەك لە دەرکە پەیابوو گۆتی ها یوسف پاشا چ دەکەی، گۆتم وەڵا دەمەویێ بڕۆم، گۆتی نەخێر ئەوشۆ مێوانی منی، گۆتی منیش وا لە رۆژەکی وا دەگەڕێم وەڵڵا لەگەر کیژەی رۆیشتم چووینە غورفەکەی کیژەی دانیشتین ئێواریێ نانمان خوارد و دەستمان بە قسان کرد تاکو درەنگی شەو کیژەکە گۆتی خەوت نایێ، گۆتم بەریێ خەوم دیێ، کیژە هەستا



جێگای راخست، گۆتم ئەدی جێگای من، گۆتی بەسە جێگایەك پێکەوە دەنوین، گۆتم باشە وەڵڵا نووستین، من خەوم نایێ ماوەکی پێچوو دەستم هاوێشتە ملی کیژەکە، کیژەکە دەستی لادام، گوتی لۆخۆت بنوو، منیش زۆرم شەرم کرد دەستم کێشاوە ماوەکی دیکە پێچوو خۆم پێنەگیرا دەستم هاوێشتەوە سەر ملی، دیسان دەستی لابردم، گۆتی یوسف پاشا ئەوجارەت مایە لۆخۆت دانیشە بنوو دیسان دەستم هاوێشتەوە ملی دەستی لادام هەستاوە لە دەرکەی گاسی کرد قازەکان وەرن هەر ئەوەندەم دی دوو قاز هاتنە ژۆریێ یەك و دەستیان گرتم لۆ دەرێیان هینام فڕەیان دامە دەریێ، هاتمە ناو بازاڕیێ ئەم عالەمەم هەموو دەناسی کەس منی نەدەناسی گۆتم بە خوای راستە دیارە من گۆڕایمە وەڵڵاهی دووەم جار چوومەوە لۆ حەمامەکە دیسان وەکی جاران کیژە هاتە لام گۆتی یوسف پاشا ئەو شەوە مێوانی منی شەو رۆیشتین چووینە ماری کیژەکەی هەر غورفەکەی جاران بوو گۆتم دەبا ئەم شەویش قازەکان فڕێم بدەنە دەریێ شەو نووستین پێکەوە دەستم هاوێشتە ملی، دەستی لادام گۆتی ئاگاداری خۆت بە ماوەیەکی کەی پێچوو دەستم هاوێشتە ملی دیسان فڕێیدام گۆتی کۆترەکان وەرن دوو کۆتری سپی هاتن دەستیان گرتم فڕێیان دامە دەریێ سبەینیێ لەو بازاڕە گەڕام کەس نەیناسیم سێیەم شەو چوومەوە لای حەمامەکە دیسان میوانی کیژەکەی بووم شەو نیوە بوو گۆتمە کیژەکەی مەسینەت هەیە دەست بە ئاو دەگەیەنم، گۆتی بەریێ ئەمەش مەسینە هاتمە دەریێ دیتم پیرەژنەك گاسی کردم، گۆتی یوسف پاشا ئەم شەوت مایە ئەم کیژە مەرجەکی هەیە ئەوی لەگەری بنوی دەستی لۆ نەبا مێردی پێدەکا، ئەوەی سیێ شەوان دەستی لۆ ببا دەیکاتە هەیکەلەکی بەردی هەتا هەتاییێ و بەو شەرتەی ئێستا دەچییەوە ژۆریێ هیچ دەنگی مەکە هەتا خۆی گاست دەکا، ئەو گاست دەکا دەریێ هەستە یوسف پاشا مارەیی من لە توو هات، پیرەژن گۆتی ئەگەر گواستتەوە لە من بگێڕەوە هەتا لە من نەگێڕیەوە نەچیە لای ئەو کیژە، یوسف پاشا لەخۆشیان خەنی بوو، چۆوە ژۆری ئەوجارە دەستی لە ملی نەکرد ماوەکی پێچوو کیژە گۆتی یوسف پاشا مارەییم لە توو هات کە دوای ماوەکی کیژەکەی مارە

کرد و جلوبەرگ و ئەسبابی لۆ دانا و کیژەکەی گواستەوە ئێوارێ کە ویستی بچیتە لای بووکێ، پیرەژنەکەی لەبیرچوو، چووە لای بووکێ لە دەرکەی پیرەژنەکە تووشی هات گۆتی ها یوسف پاشا ئەدی نەمگوت هەتا بە من نەرێی نەچیە لای بووکێ، گۆتی وەڵڵاهی لە فکرم نەمابوو نازانم چ برێم پیرەژن گۆتی وەرە، هاتە کن بووکێ شورکە دارەکی لە بووکێ دا، گۆتی بەبێ دەنگو قسەبە هەتا مای، و شورەکەکی لەخۆی دا خۆی کردە مەیمون وەرە با بچین تەماشایان بکەین لەگەر مێوانەکەی هاتن تەماشایان کرد بەرێ تەواوە گۆتی ئەوە بەسەرهاتی منە کاکی میوانی بەرێز. یوسف پاشا گۆتیە مێوانەکەی ئەمن پرسیارەکم هەیە دەبی جوابی ئەم پرسیارەم لۆ بینیەوە، مێوان گۆتی فەرموو، گۆتی کورە پاشایەك هەیە لە شاری واق واقێ هەموو رۆژێ جومعان دووسەت سێ سەت سواری خڕدەکاتەوە بە دۆر و زورنا و بەستە و مەقام گۆتن دەرۆنە کەیف و سەیرانەکی مەپرسە گردەك هەیە دووری شاری وەکی گەیشتنە ئەم گردەی هەموویان سەری خۆیان لە قورێ دەنێن دەست بە گریان دەکەن هەتا دەگەرێنەوە ماری هەرو بزانە ئەم کورە پاشایە لۆ وا دەکا، مێوانەکەی گۆتی بەسەرچاو یوسف پاشا شەرتی پیاوان جوابت لۆ بینمەوە، سبەینێ هەستا رێگای گرتەبەر لێیدا رۆیی هەتا گەیشتە شاری واق واقێ تەماشای کرد رۆژی جومعە ئەو کورە پاشایە چەند سواری خڕکردنەوە بە دۆر و زۆرنایەك مەپرسە لێیاندا رۆیشتن ماوەیەکی پێچوو هاتنەوە هەموویان سەریان لە قورێ نایە بە شین و گریان وا دێنەوە، مێوانەکە هەرکوەك هەبوو خۆی گەیاندە کورە پاشایەکە شەو لە کنی مێوان بوو دانیشتن دەستیان بە قسان کرد، مێوانەکە گۆتی باشە پرسیارەکت لێ دەکەم بەس تو ئەو خوایە بە راستی جوابم بدەوە، کورە پاشا گۆتی فەرموو پرسیارەکەت بکە، مێوان گۆتی باشە ئەورۆ ئەتوو لەگەر ئەوەندە سوارەی بە دۆر و زورنا بە کەیف خۆشی رۆیشتن وەکی هاتنەوە لۆ هەمووتان سەرتان لە قۆرێ نابوو بە شین و گریان گەرانەوە، کورە پاشا گۆتی کاکی مێوان دەردی من و یوسف پاشا و کۆرەی یەمەنی بەتوو چارەسەر ناکرێ، کورە لۆ خۆت واز بێنە، مێوان گۆتی ئەو سەرەی هینایتم



نایگێڕمەوە پێم برێ، کورە پاشا گۆتی باشە دوایی ئەمن پرسیارەکت لێ دەکەم دەبی جوابەکم لۆ بینیەوە، مێوانەکە گۆتی فەرموو، کورە پاشایەکە گۆتی کاکی مێوان چاك لۆ خۆت گێ بگرە، گۆتی من کورە پاشا بووم لەم شارە حەزم لە کیژە پەرییەکی دەکرد زۆر یەکدیمان خۆش دەویست رۆژەك گۆتمە بابم حار و حیکایەتی من ئەوهایە دەبی بچی ئەو کیژە پەرییەم لۆ داخوازی بکەی، بابم گۆتی کورم ئێمە لەگەر ئەوانە کەلکی یەکمان نییە وەرە لەو شارەی کیژی کێت دەوێ هەتا لۆت بینم ئەمنیش گۆتم نەخێر بابە ئیللا ئەو کیژەم دەوێ ئاخری قسەی لۆی نەینام ئەمنیش گۆتمە بابم ئەگەر لۆم نەینی خۆم دەچمە لای ئەم کیژە، بابم گۆتی ئەگەر بەخۆت دەچیە لای ئەم کیژە نەکەی بگەرێیەوە لای ئێمە، گۆتم باشە رۆیشتم چوومە لای ماری بابی کیژەکە دانیشتم بابی کیژەکە گۆتی فلان، گۆتم بەرێ من ئەو کیژەت دەدەمێ بە شەرتەك من چیتان لێ بکەم نابی دەنگێ بکەی، گۆتم بەرێ، دەرێ کیژەکەی لێ مارەکردم و چەك و جلکی لۆ کیژەکەی کرد و لۆی گواستمەوە ساری یەکەم کورەکمان بوو ماوەیەکی پێچوو بابی کیژەکە هاتە مارێ ئێمە دانیشت مندارەکە گریا، گۆتی ئەو مندارەتان بووە، ژنەکەم گۆتی بەرێ، گۆتی دەبینە بزانم مندارەکی جوانە، مندارەکەی هینا تەماشای مندارەکەی کرد پێکەنی مەشخەلە ئاگرێکی گەورەمان لە پێش بوو ختیە ناو ئاگرەکە و کورەکە سوتا هەتا بوو بە رەژوو لێیدا رۆیی، گۆتمە ژنەکەم ئەوە بابت ئەم کورەی لۆ سوتاند، گۆتی نازانم، سار سورایەوە کورەکی دیکەمان بوو گۆتمە ژنەکەم ئەگەر بابیشت هاتە ئێرە نەرێی مندارمان بووە، گۆتی باشە مندارەکە گەورە بوو بووە هەشت نۆ مانگ بابە هاتە مارمانەوە گۆتی ئەوە مندارتان بووە خەبەری منتان نەدایە گۆتیە کورەکەی وەرە بابەی کورەکە چووە کن باپیری و باپیری لوراندی وەکی گورگی گورگەك پەیابوو کورەکەی ختە ناو دەوی گورگەکە و گورگەکە بردی بابی لێیدا رۆیی، گۆتمە ژنەکەم ئەوە بابت لۆ وایکرد، گۆتی نازانم و لە خەمان هیشك بوومەوە، سار سوراوە کورەکی دیکەمان بوو گۆتمە ژنەکەم ئەو کورەی نابەیە دەرێ بە هیچ جۆرێك و بابیشت هاتە ئێرە دەبەیە ئەم مارانە دەیشاریەوە، ژنەکەم گۆتی باشە

کوڕەکە گەورە بوو لە باپیرمان شاردەوە، کوڕەکە بە پێیان دەڕۆیی ڕۆژەك داکی چوو لۆ سەر کارێز ئاوێ بینێ کوڕەکە لەگەر داکی دەچی باپیریشی لەسەر کارێزەکە لەگەر پیاوێك دانیشتبوو دەرێ کیژم ئەو کوڕە هی تووە دەرێ بەرێ بابە، کوڕەکەی دەگری و دەیهاوێتە ناو کارێزەکەوە دەیخنکێنێ ژنەکە دەگەڕێتەوە کوڕەی پێنییە، گۆتم کا کوڕەکە گۆتی وەڵڵا بابم هاوێشتیە ناو کارێزەکە و خنکاوە، گۆتم یالا ئێستا دەچیەوە ماری بابت منیش دەڕۆم جارەکی دیکە چاوت بە من ناکەوێ ژنەکە چووە لای ماری بابی، بابی گۆتی ها کیژم لۆ هاتیەوە، وەڵڵاهی پیاوەکەم دەری کردم و گۆتی نەبێیەوە لۆ لای من، گۆتی وەرە کیژم هاتن گەیشتنە ماری مە، بابی گۆتی کیژم نەمگوت مێرد بە ئادەمیزاد مەکە بێ سفەتن هەر لەبەر کوڕەکانی ئەوە کۆرەکانت تەماشام کرد هەرسێ کوڕەکەم هاتنەوە بەس گۆتی یالڵا لێرە نەمینێن دەبی ئێستا بڕۆن منیش دەستی کوڕەکانم گرتوو ژنە کەتە دووم هاتین، هاتین تا گەیشتینە نێزیك ئەو شارەی خۆمان لەوێ گردەکی برند هەیە گۆتم ئەمن کوڕە پاشامە و گەورەی ئەو شارەمە کو دەبی بچمە ئەو شارەی بەبێ دەنگی بچمەوە ماریێ چەند سواری لەگەر خۆم خڕکەمەوە بە دۆرو زوڕنا و مەقام گۆتن بێم بچینەوە ماریێ وەکی ئەوانم لەسەر گردەکەی بەجێ هێشت ژنەکە گۆتی کابرا ئەگەر شەوەکت پێچوو کفنەکی بینە ئەگەر دووت پێچوو دوو کفنان بینە، ئەگەر چارت پێچوو چار کفنان بینەوە، گۆتم باشە وەڵڵاهی هاتمەوە ناو شاری تەماشام کرد لە پێش ماری بابم عالەم شین و گریانەکە مەپرسە، گۆتم ئەوە چییە؟، گۆتیان کوڕە ئەتوو ئەوە لەکێندەرێی دونیا نەما لە دووت نەگەڕێین داك و بابت مردینە ئەمری خوایان کردیە وەڵڵا دەرێ هەتا ئەمە چووینە سەر قەبران قەبر لێدرا دانیشتین لە تازیەکەی فاتیحە خەلاس بوو، ژنە و مندارم لەبیرچوو پاشان هەستام چەند سوارم خڕکردەوە بە دۆر و زوڕنا و مەقام گۆتن ڕۆیشتین لۆ سەر گردەکەی کە چووین گەیشتینە سەر گردەکە ئەوانیش هەر چاریان لەوێ مردبوون دەستمان بە قەبر لێدان کرد لەسەر گردەکەی شاردمانەوە سەری خۆمان لە قوڕێ ناو بە گریان گەڕاینەوە ئێستاش لۆیێ ئەو سوارانەم خڕدەکەمەوە بە کەیف



خۆشی و مەقام گۆتن دەچینەوە یادی وان دەکەمەوە ئەوە بەسەرهاتی من بوو لۆ توو، مێوان گۆتی فەرموو ئەوجا پرسیارەکەت بکە. گۆتی چەمەك هەیە لەو شارە دوورە غاباتەکی گەورەی هەیە تەیرەکی سپیی گەورەی لێیە ئەم تەیرە پەرییە دارەکی گەلەك گەورەی لێیە تەیرەکە دێتە سەر ئەو دارەی دەخینی ئەوی ئەم تەیرە بکوژی هەر فکری هەبی و هەر مرازەکی هەتە دێتەجێ چاك دەبی، دەبی ئەم تەیرەمان لۆ بکوژی منیش چاك دەبم و یوسف پاشاش چاك دەبی و کۆرەی یەمەنیش چاك دەبی، مێوان دەرێ بەرێ، کوڕە پاشا دەرێ با پێت بڕێم ئەگەر نەتکوشت دەبیە بەردەکی گەورە لەوێ دەکەوی و زۆر کەس وەکی توو بوویتە بەرد لەوێ دارەکەش مێزەك و سێ تیر و کەوانەکی لەسەر دانرایە حازر، مێوان دەرێ باشە سبەینێ مێوان هەستا ڕۆیی هەتا گەیشتە غاباتەکی گەڕا و سوڕا، دیتی دارەکی زۆر و زۆر برند دیارە چووە کن دارەکەی تەماشای کرد لەبن دارەکە مێزەك و کورسییەك و سێ تیر و کەوانێك دانراوە و تەماشای کرد هەر چاردەوری ئەم هەموو بەردی گەورەیە، گۆتی بەرێ بە خوای ئەم بەردانە وەکی من زەلام بووینە هەر ئەوەندەی زانی تەیرەکە هاتە سەر دارەکەی دەستی بە خوێندن کرد ئەویش خۆی حازرکرد دەستی گەیاندە تیر و کەوانەکە تیرەکی تێگرت ئەو لێیدا تەیرەکەی کوشت و خستیە ناو تورەگە و گەڕایەوە لای کوڕە پاشا و میوان بوو ئێوارێ، گۆتی نامناسیەوە بەرێ دەتناسمەوە ئەدی کو گەڕایەوە، دەستی لەناو تورەگەکەی نا و تەیرەکەی دەرهینا، کورە پاشا خەنی بوو، پارچە گۆشتەکی لێ کردەوە و کوراندی و خواردی و ژنەکە و مندارەکان لەسەر گردەکە گاسیان دەکرد هۆ خەرکی شار دەبرێنە بابم بێ بمانباتەوە، خەبەریاندایە کوڕە پاشای، کوڕە خەنی بوو گۆتی مێوان فەرموو چیت دەوێ برێ، گۆتی خۆشیت، ئەو چوو مندارەکانی بهینتەوە، مێوان گەڕاوە کن یوسف پاشای چووە چایەخانەکەی گۆتی ها یوسف پاشا نامناسیەوە، بەرێ بەخێربێیەوە وەڵڵا هاتنەوە ماریێ پارچەك گۆشتی دا بە یوسف پاشا ژنەکەی یوسف پاشاش چاك بووەوە وەکی جاران، بەیانی لێیدا گەڕاوە کن کۆرەی یەمەنی کە سەلامی لە کۆرەی یەمەنی کرد، گۆتی کۆرە نامناسیەوە، گۆتی

دەتناسمەوە وەرە با بچینە مارێ، هاتنەوە مارێ لەگەر کۆرەی وەڵڵا کۆرەش پارچەکی لە گۆشتەکەی کوراند و خواردی ئیتر چاوی چاك بووەوە وەکی جاران، مێوان گۆتی پێم برێ ئەتو چاوت لۆ کۆرە بوو، کۆرە گۆتی من یەکەم ئاسنگەر بووم لەو شارە زۆر بەناوبانگ بووم لە ئاسنگەری عالەم هەمووی رووی لە من دەکرد رۆژێك چەند برادەرێکی جۆتیار هاتنە لام کە ئیشیان لۆ بکەم داوای ئاویان کرد ئەو کاتی ئاو لە دوکان نەمابوو برازایەکم لەلای من شاگرد بوو گۆسکەکم دا دەستی پێم گۆت، گۆتم برۆ لە زێی پڕ ئاویکە خێرا بگەڕێوە، برازایەکم رۆیی نەهاتەوە کاتەك مێوانەکان رۆیشتن ئاویان نەخواردەوە، برازایەکەم زۆر تاخیر هاتەوە پێم گۆت لۆ تاخیر بووی کوڕم، گۆتی وەڵڵا مامە شتەکم دیتەوە ئەگەر ئەتوو ببیبینی هەر نایەوە، گۆتم چییە، گۆتی شتەکی زۆر زەرد وەکو رۆژ بەڵام رۆژ نییە، وا لەناو ئەو کونە شاخەیە، مامی گۆتی وەرە با بچین، هاتن گەیشتنە سەر زێییێ تەماشای کرد قسەکانی تەواوە لە دری خۆی گۆتی ئەوە هەموو زێڕە، پێی گۆت وەرە لەکن کەس قسەی نەکەی ئەوشۆ دێین دەری دەینین، دەیبەینەوە، شەوێ خۆیان حازر کرد هاتن لەسەر شاخەکەی راوەستان گۆتی وەرە کوڕم بە عەبلی شۆڕت دەکەمەوە هەڕوو بزانە چییە، شۆڕی کردەوە، گۆتی مامە ئەو زەردابیە هەمووی زێڕە مامی گۆتی کوڕم وا گوشت لۆ شۆڕ دەکەمەوە لە گوشی بکە ئەمن رات دەکێشم لۆ سەرەوە، گوشی شۆڕکردەوە لە گوشی کرد، مامیشی رای کێشا چەند گوشەکی راکێشا کە خەلاس بوو، کوڕەکەی راکێشاوە لۆ سەرەوە گوشەکانیان کێشاوە مارێ، زێڕەکی گەلەك زۆر بوو، فکری مامی گۆڕا گۆتی وا چاکە ئەو کوڕە سەربڕم، لەبەر ئەوەی نەبادا رۆژەك لە رۆژان تووڕەبی برێ وەڵڵا ئەوەندە زێڕەمان لەگەر مامم دەرهینایە، چەقووەکی زۆر تیژی هەبوو کوڕەکەی گرت، کوڕەکە گۆتی مامە چم لێ دەکەی، مامی گۆتی سەرت دەبڕم، کوڕە گۆتی مامە ئامان دەخیل سەرم مەبڕە ئەمن لەکن کەس قسەی ناکەم، گۆتی نەخێر کوڕم سەرت دەبڕم، گۆتی کوڕەکەم سەربڕی مەیتەکەم هینا فڕەمدا ناو زێییێ، چوومەوە گوشەکانم هینا تەماشای زێڕەکان بکەم کاتەك گوشەکەم کردەوە شرقەکی گەورە لە گوشەکەی



هات، دوو هەتا سێ پڕوشك بە سەر و چاوم کەت، لەو کاتیەوە چاوم کۆرە بوو ئێستاش لەبەر پەشیمان بوونەوەی خۆم کە بوومە قاتیلی ئەو برازایەی خۆم ئەو کوپە ماستاوە لەگەر کوپە ئاوەکەی لەگەر تەشتە روپیەکەیش هەر دەگری، دەستەکی تەڕ دەکا شەقەکم لە بنی گێی دەدا دەرێ کیری پیاوی بێ تەماع بە قونی هی پیاوی بێ تەماع دەشپاڕێمەوە لەبەر خوای کە لەو قەتلەی عەفوم بکا، ئەوجا کۆرە گۆتی مێوان فەرموو برێ چت دەوێ هەتا لۆت بکەم، مێوان گۆتی کۆرە ئەتوو بەخۆت نازانی؟ کۆرە گۆتی سبەینێ وراغەکی چاك بکڕە تێرکەکی چاك بکڕە، وەرەوە، چوو وراغەکی کڕی، تێرکەی کڕی هاتەوە، کۆرە پێی گۆ، مێوان ئێستا ئەم تێرکەت لۆ پڕ لیرە دەکەم هەرزوو ژنی خۆت بگوازەوە پاشان دەستی ژنەکەت بگرە وەرە کنە من لۆ خۆمان هەتا مردنێ دابنیشین و دەیخۆین، گۆتی باشە گەڕاوە هاتەوە ژنەکەی گواستەوە و ماوەکی باش لەوێ مایەوە، دوایی دەستی ژنەکەی گرت و هاتن هەتا گەیشتنە شاری یەمەن لۆ خۆیان دانیشتن هەرسێکیان پێکەوە.

------------------------------------

* ئەم هەقایەتەم لەسەر زاری هەقایەتبێژ مەحموود خدر محەمەد سیان گوێ لێ بووە لە دایکبووی ١٩٤٨ و ئێستا لە شاری هەولێر نیشتەجێیە.

* لە گۆڤاری ئاسۆی فۆلکلۆر ژمارە ٢٣ ساڵی ٢٠٠٦ بڵاوکراوەتەوە.

# پاشایەکی زاڵم

هەبوو نەبوو کەس لە خودای گەورەتر نەبوو، پاشایەکی زاڵم هەبوو کیژەکی هەبوو هەرچەند برێی جوان بوو، هەرچی بچووبایە داخوازی کیژەکەی دەیکوشت لەبەرئەوەی شەرتەکی هەبوو کەس لۆی نەدەکرا. لەم گوندە گاوانەك هەبوو برازایەکی هەتیمی لەکن بوو، هەموو رۆژ کوڕە هەتیم دەچووە راو چیی بگرتایە دەیخوارد ژیانی لەسەر ئەو راوکردنە بوو. تا رۆژەك لە راو ماینەکەی دەتۆپێ و شەوی بەسەردادێ لە دەشتەکی چۆڵ بەتەنێ دەمێنێتەوە، شەو زۆری برسی دەبێ و بە زگی برسییەوە لێی دەنوی، کە لۆ بەیانی دەبینی قۆدییەك لەبن سەری کەتییە سەری قۆدییەکە دەکاتەوە، قۆدی دەرێ: بفەرموو، کوڕە دەرێ نانەکم بدێ، نانەك دێتە پێشی و نانەکە دەخوا و قودییەکە لە گیرفان دەنێ، دەرێ نیعمەتەکی گەورەیە پاش ماوەیەك دیسان قۆدییەکە دەردێنی، قۆدییەکە دەرێ: بفەرموو، کوڕە دەرێ: دوو مریشکی سۆرکراوەم دەوێ. دوو مریشك دێتە پێشی، کوڕە مریشکەکان دەخوا و دەگەڕێتەوە ماڕێ و قۆدییەکەش لەگەرە خۆی دەهێنێتەوە، یەکسەر روو لە مامی دەکا و دەرێ، مامە لۆم بڕۆ داخوازی کیژە پاشای، مامی دەرێ: کوڕم ئەمنەکی گاوانی گوندی چ قەدرەکم لەکنی هەیە. ئەوە قەشمەری بەخۆکردنە، ئەو قسەی بە پاشای برێم بە ساغ و سەلامەتی دێمە دەرێ! لەسەری هەزاران کوڕە پاشا و میرانی دایە ئەمن کو شتی وا دەکەم. کوڕە دەرێ، دەبی هەر بچی، مامی دەرێ پاشا شەرتی هەیە بەشەرت کیژەی بە مێرد دەدا ئەوجا ئەمە چمان پێ دەکرێ بە چەند کوڕە پاشا و میران نەکرا، کوڕە بە گریانەوە



دەرێ هەر چ شەرتەکی هەبی لۆی جێبەجێ دەکەم، ئای گەر بابم بمابایە ئەرحان لۆم دەچووە داخوازی، کە کوڕەکە دەگرییێ مامی زگی پێ دەسوتێ لۆیە دەرێ وەڵڵاهی پاشا لەسەریشم بدا هەر دەچم، مامەی دەچی لۆ ماری پاشای پاش کەمەك دانیشتن پاشا دەرێ مام گاوان خێرە هاتی. گاوان دەرێ پاشام خۆش بی هاتیمە داخوازی کیژەکەت لۆ برازایەکەم، ئاغا بە قەشمەری لەگەری دەدوا و پێی عەنتیکە بوو لۆیە گۆتی: مام گاوان پەشیمان نابییەوە، گاوان گۆتی: نەخێر، پاشا گۆتی ئەتوو کابرایەکی فەقیری ئەوە ئیشی توو نییە. گاوان گۆتی: شەرتت چییە لۆت جێبەجێ دەکەم، پاشا گۆتی: دیارە لەگەرە توو بێ ئیستیفادەیە، باشە شەرتی من ئەوەیە لۆ ماوەی یەك مانگ خانییەکی زێڕ لۆ کیژەکەم دروست بکا، ئەگەر دروستی نەکرد لەسەری هەمووتان دەدەم. گاوان گۆتی باشە، زۆر بە غەمباری گەڕایەوە ماڕێ و شەرتەکەی بە برازایەکەی گۆت بەران بە گریان و بابەڕۆ، کوڕە بەسەرەخۆی نەینا و گۆتی مامە ئەمن نەمزانی شەرتی وای هەیە. ئەمن دەمگۆت لەوانەیە مەڕ و ماراتی بووێ. بەو جۆرە تا گەیشتنە بیست و نۆیەمین رۆژ. گاوان گۆتیە منداڕەکانی خۆتان حازرکەن، بزانە ئەو برازایەم چیی بەسەرهێنایین، ئەو شەوی هیچیان نەنووستن تا مەلا بانگدان. کوڕە قۆدیی دەرهێنا و قۆدی فەرمووی بفەرموو. کوڕە گۆتی: لۆ بەیانی خانییەکی زێڕم دەوێ. لە فلاَن جێ لۆ بەیانی خانییەکی زێڕ دروست کرا، خەرکی شارەکە سەریان سوڕما ئەو خانییە کو دروست کرا، بە پاشا راگەیاندرا پاشا وڕ داما کو ئەو خانییە دروست کرا لۆ ماوەی بیست و نۆ رۆژ هیچ نەبوو، مامی و کوڕەکانی لە خۆشییان خەنی بوون. پێیان حەردی نەدەگرت، ئەوجا پاشا لە دوو کوڕەی نارد، بەران کوڕە نەچوو. وەزیری دەستە چەپی ناردە دوای نەچوو. وەزیری دەستە راستی ناردە دوای کوڕە نەچوو هەتا خۆشی لە وەزیر تووڕە کرد گۆتی ئەمن نایەمە کنتان ئەنگۆ زاڵمن، ئەوجا پاشا بەخۆی هاتە کنی و گۆتی کیژی من بوو بە حەراری توو پاشایەتیش لە توو دەوەشێتەوە ببە بە پاشا، کوڕە گۆتی، ئەمن نامەوێ ببم بە پاشا

با مامم لەجێی من ببتە پاشا، پاشا مامی کوڕەی دەکا بە پاشا لە جێی خۆی کیژەش پێشکەش بە کوڕە دەکا و خۆشی دەبتە وەزیر.

کوڕە کیژە پاشای دەگواستەوە و بە بێتامی یەکتریان خۆش دەویست، کیژە هەرچییەکی بویستایە کوڕە بە دزی بە قۆدی دەگۆت، قۆدی لە پێشی دادەنا، هەروەها کوڕە و بابی کیژەی هەموو رۆژ دەچوونە راوێ و کوڕە هیچ رۆژەکی بە دەستی بەتار نەدەگەڕاوە، کوڕە و کیژە خزمەتکارێکیان هەبوو، رۆژەك خزمەتکارەکە قۆدییەکەی دەبینی لۆیە دەرێتە کیژەی مێردەکەت ئەتووی خۆش ناوێ، چونکە ئەگەر ئەتووی خۆش بووێ، داوای قۆدییەی لێ بکەی با بتداتێ بەران ئەتووی خۆشی ناوێ و قۆدییەکەت ناداتێ، کیژە ئەو قسەیەی لە در دەبی، لۆیێ کە کوڕە لە راو دەگەڕێتەوە ماریێ کیژە بە گریان دەرێتە کوڕەی ئەمن ئەوەندە ئەتوم خۆش دەوێ بەران ئەتوو ئەمنت خۆش ناوێ، کوڕە گۆتی: باشە هەرچی داوات کردبی لۆم نەهینای کیژە گۆتی: با لۆت هینایمە بەران قۆدییەکت هەیە بمدێ. کوڕە گۆتی: هەر لۆ قۆدی، ها ئەوە قۆدی، بەران مەیدە کەس لەکن قۆدییەکی پیسی دانێ، کیژە گۆتی: باشە، لۆ سبەینێ بەیانییەکەی کوڕە و بابی کیژەی رۆیشتن لۆ راوێ، خزمەتکارەکە هاتە کن کیژە پاشا و گۆتی کا قۆدییەکەی پێ دای، کیژە گۆتی. ئەوەتە قۆدییەکەی دایمێ، هەر پێم شەرمە هەر هەری بگرم، خزمەتکارەکە قۆدییەکەی هەرگرت چونکە دەیزانی قۆدییەکە چ نیعمەتەکە، بردیە دەرێ و سەرەکەی هەرگرت قۆدی گۆتی: بفەرموو، خزمەتکار گۆتی، دەمەوێ ئەو خانییەی فڕێ بدەیە بن حەفت دەریایان، خانییەکەی فڕێ دایە بن حەفت دەریایان خزمەتکار و کیژە و قۆدیشی تێدایە. ئێوارە کە کوڕە و بابی کیژەی دەگەڕێنەوە دەبینن خانییەکە نەمایە، نە کیژە، نە خزمەتکار دیار نییە، بابی کیژەی گۆتییە کوڕەی شتەك هەیە، ئەرحان لەسەرت دەدەم لۆ نەمایە، کوڕە گۆتی ئەمن چ بکەم وەکی رۆیشتین خانییەکە مابوو، ماوەکم بدە ئینشاڵڵا چارەی دەکەم بابی کیژەی گۆتی: لۆ ماوەی یەك مانگ خانییەکە و کیژەی بگەڕێنیەوە حافوت دەکەم ئەگەر نا لەسەرت دەدەم، کوڕە گۆتی: باشە رێی گرتەبەر و رۆیشت



لەملاو لەولا دەگەڕا هەتا لە رێگا تووشی کابرایەك بوو هەرچەند برێی ئاقر بوو، کابرا گۆتی: ها لۆچی دەگەڕێی، کوڕە، بەسەرهاتی خۆی لۆ گێڕایەوە کابرا گۆتی: ئەو رێگایە زۆر بە ترسە، زۆر ئازا نەبی دەتکوژن، کوڕە گۆتی: ناترسێم بەس کو بڕۆم، کابرا گۆتی: ئەو رێیە بگرە و بڕۆ کاتەکی دەگەیە ژنەکی دەستارەکی لێ دەکا. دەنگی زۆر دێت، هەرکە گەیشتیێ، مەمکەکانی زۆر گەورەیە یەکسەر پڕ بدە مەمکی لە مەمکی شیر بخۆ، ئەوجا ئەو رێت لۆ دادەنێ، کوڕە چوو کابرا چی پێ گۆتبوو ئاوای کرد، ئەوجا ژنە گۆتی: ها چت دەوێ، کوڕە بەسەرهاتی خۆی لۆ گێڕایەوە، ژنە دەرێ زۆر زەحمەتە، رێوییەك لە تەنیشت ژنەکە دەبی دەرێ قسەکی بکەم، ژنە دەرێ رێوی پیس ئەتو چ دەزانی رێوی دەرێ ئێ دایە ئەمر بکە هەموو تەیر و حەیواناتەك بێتە کنت لێیان بپرسە لەوانەیە ئەوان دیتبیان، ژنەکە گۆتی راست دەکەی، ئەمر دەکا هەموو تەیر و حەیواناتەك دێنە کنی، پرسیاری لێ کردن هەموو گۆتیان ئەمە نەمان دیتییە، تەنها تەیری حورە نەبی گۆتی ئەمن شتەکی وام بیستییە، بەران لەبن حەفت دەریایە، تەیرەکە زۆر حەول دەدا بێ ئیستیفادە دەبی لە ماندی بوونان هەموو پەڕی لێ دەبێتەوە، بەران دەرێتە تەیرەکان هەتا ماوەیەك هەموو رۆژ خواردنم لۆ بینن هەتا تاقەتم دەبیتەوە. تەیرەکانیش لۆ ماوەیەك خواردنی باشی لۆ دەبەن و پەڕ و باری دێتەوە و ئەوجا دەرێ بمبەنە سەر گردێك لۆ ئەوەی زۆر بەقەیم خۆم فڕی دەمە بن حەفت دەریایان، تەیرەکەی دەبەنە سەر گردەکی برند، ئەوجا گۆتیە کوڕەی وەرە سەر پشتم و خۆت توند بگرە کوڕە دەچتە سەر پشتی و خۆی توند دەگری، تەیر بە قەیم خۆی لە دەریایەکان نقوم دەکا و کوڕەی دەگەیەنێتە ناو خانییەکەی، کە کوڕە چووە ناو خانییەکەی دەبینی خزمەتکار و کیژە بە رووتی لێی نووستینە کوڕە قسە ناکا و یەکسەر قۆدییەکەی هەردەگری و سەری دەکاتەوە و قۆدی دەرێ. بفەرموو، کوڕە دەرێ دەمەوێ خانییەکەی ببەیەوە جێی خۆی. یەکسەر خانییەکە دەچیتە جێی خۆی، کوڕە گاسی بابی کیژەی دەکا و دەرێ وەرە ببینە کە بابە دەچی دەبینی کیژە و خزمەتکارەکە بە رووتی بەیەکەوە نووستینە، دەرێ دارم لۆ

خڕبکەوە. دارەکی زۆری لۆ خڕدەکەنەوە و خزمەتکارەکەی داوێنە ناو دارەکەی ئاگرەکی لە دارەکەی بەردەدەن و خزمەتکارەکە لە ناوی دەستووتێ دەمرێ، ئەمنیش کراشەم دڕا و چم پێ نەبڕا.

---

* لەسەر زاری محەمەد خدر تۆمارکراوە.

* لە گۆڤاری کاروان ژمارە ١٢٦ ساڵی ١٩٩٨ بە ناوی ئەحمەد جەمال بڵاوکراوەتەوە.

## دزێکی نەقۆرا

دەگێڕنەوە دەرێن کوڕەك تاقانە دەبی، داك و بابی دەمری، خاری بەخێوی دەکا، خاریشی وجاغ کۆر دەبی هیچ منداری نییە، کوڕەکە گەورە دەبی، دەبیستی هەست رادەگری خاری هیچ ئیش و کاری نییە، زۆر جوانیش بەڕێوەدەچی، رۆژەك بە خاری گۆ، گۆتی: خارە ئەتوو چ ئیشەکی دەکەی جوابی داوە خاری گۆتی کوڕم ئەو سوئالە پەیوەندی بە تووەوە نییە ئەتوو دانیشە لۆ خۆت وا دەژی، دەرێ کۆڕەکە زۆری بووە مەرەق وازی لە خاری نەینا خاریشی گۆتی مادام مەرەقی کردیە بزانی ئیشی من چییە با پێی برێم گۆتی: کوڕم ئەمن دزی دەکەم، گۆتی خارە ئەتوو دزیت پێ دەکرێ، گۆتی بەرێ، گۆتی باشە وەرە ئەمن و توو گرەوەکی دەکەین بزانین کاممان دزیمان پێ دەکرێ، خاریشی گۆتی کوڕم، ئەتوو منداری دزی بەتوو ناکرێ کوڕەکە گۆتی وام تێ مەگە ئەو دزیی ئەمن دەیکەم بەتوو هەر ناکرێ خاری گۆتی ئەو نەوعە دزەی ئەتوو، گۆتی بەرێ گەر باوەڕیش ناکەی با گرەوی بکەین، گۆتی گرۆیەکەت چییە برێ گۆتی خارە حاجی لەق لەقەك هێلانەی وا لەسەر خانی خۆمانە، بە رۆژ نەك بە شەو بزانین کاممان هێلکەکانی لەبن دەدزیت پێش ئەوەی لەق لەقەکە بفڕی یان هەست پێ بکا، دەرێ خاری سەری سوڕما فکری لێکردەوە هێلکەی لەبن لەق لەقی دەربینی لەق لەق کوو نافڕی یان کوو هەستی پێ ناکا خاری گۆتی باشە کوڕم سبیانێ هێلکەکانی لێ دەدزین، ئەوجا سبەینێ کە هەستان کوڕەکە گاسی خاری کرد گۆتی وەرە خارە ئەوە لەق لەقەکە لەسەر هێلانەکەی نیشتییە تەماشام بکە ئێستا دەچم، هێلکەکانی لەبن



دەدزم بێ ئەوەی هەستی پێ کا، خاری زۆر لەبەر کوڕەکەی دری مشەوەش بوو گۆتی: کەس نییە دزی لە من بباتەوە ئەم خوارزایەی من ئەو نەوعە دزەیە دزی لە من بباتەوە گۆتی راوەستە کوڕم هێشتا ئەتوو منداری وات لێنەهاتییە دزی لە خارت ببەیەوە، بەخۆم دەچم هێلکەکان لە مام لەق لەق دەدزم، کوڕەکە جوابی داوە گۆتی: فەرموو خارە ئەوە ئەتوو، ئەوەش مام لەق لەق، خاری بەسەر دیواری کەت کە بچی هێلکەکان بدزێ، کوڕەکە لە دوو خاری چووە سەر دیواری بێ ئەوەی خاری هەست پێ بکا، خاری تەماشای کرد مام لەق لەق بە ئاگایە نەنووستییە، هەردوو چاوی زەقە پارێزی هاوێشتە لەق لەقی لەسەر زگ لۆی خشی کوڕەکەش لەدوو خاری دەخشی خاری دەستی گەیاندە هێلکەی حاجی لەق لەق کە بینتە دەرێ لە بنی بێ ئەوەی مام لەق لەق هەست پێ بکا، لە مشەوەشی خۆی هیچ ئاگای لەخۆ نەما کوڕەکە بە زانایی لەسەرەخۆ دۆخینی شەروارەکەی خاری کردەوە، شەروارەکەی لەپێ کردەوە، بێ ئەوەی خاری هەست پێ بکا هاتە خوارێ لەسەر بانی چاوەڕوانی خاری کرد کە بێتە خوارێ، خاری هێلکەکانی بەدەستەوە بوو هاتە خوارێ، گۆتی کوڕم ئەوە هێلکەکان کوڕەکە گۆتی، خارە بە لاقی رووتت دیارە هێلکەکانت دزی، دەرێ خاری هێشتا هەستی پێ نەکردبوو، کە تەماشای خۆی کرد لاقی رووتە شەروارەکە وا لە دەست خوارزایتی گۆتی کەینێ ئەو شەروارەت لە پێی من کردەوە، کوڕەکە گۆتی، وەختی کە مشەوەش بووی هێلکەکانت دزی منیش شەروارەکەی تۆم دزی، دزییەکەی کاممان بەقوەت ترە خاری جوابی داوە، گۆتی، کوڕم وەڵلا دزییەکەی توو بەقوەت ترە. مادام ئەتوو ئەو نەوعە دزەی لۆ زوو خەبەری منت نەدەدا، گۆتی خارە ئەمن هەر پێم عەیبە دزی گچکۆکە بکەم، خاری گۆتی، کوڕم وەرە دزییەکی زۆر گەورە بکەین، گۆتی برێ دزییەکە چییە گۆتی دزییەکە دزینی قاسەی ماری پاشایە، گۆتی خارە دەگەیە قاسەی ماری پاشای، خاری هەرچەندی فکری لێکرد هیچ رێگایەکی وای نەدیتەوە کە بگاتە قاسەی پاشای گۆتی: کوڕم چەندی فکران دەکەمەوە رێگایەکی نابینمەوە کە بگەمە قاسەی پاشای، کوڕەکەی گۆتی: خارە ئاو خواردنەوە لەکنە من

گرانترە لەو دزییەی، خاری گۆتی کوو، گۆتی ئەتوو هەقت نەبی، گۆتی پێم نارێی، گۆتی نەخێر کەینێ مارەکەم هەموو هینا ئەوجا پێت دەرێم خاری زۆر قەلەق بوو گۆتی ئەو مندارە ئەگەر گیرا هەنگینێ ئەمنیش ئاشکرا دەبم پاشا لە سەرما دەداتن گۆتی کورم ئەگەر ناتوانی مەچوو یان پێکەوە دەچین گۆتی: نەخێر خارە ئەوە جێگای دوو زەلامان نییە بچین، کورەکە هات تاقیبی مارێ پاشای کرد پاشا شوانەکی هەبوو بزنی زۆر جوانی هەبوو فکری لێکرد، کورەکە وا چاکە تەگبیرەکی بکەم لەگەر بزنان بچمە ژۆرێی ماری پاشای فکری کرد گۆتی بزنەکی بکرم لە رەنگی بزنەکانی ماری پاشای بی بزنەکەی کری لە رەنگی بزنەکانی پاشای بردییە کن قەسابی گۆتی ئەو بزنەم لۆ دەربینە گۆشتەکە لۆ خۆت پیستەکە لۆ من پیستەکەشم لۆ بغارێنە کە بە خۆم بچمە ناو پیستەکەی قەسابەکە گۆتی باشە بزنەکەی سەربری گۆشتەکەی دەرینا و بە چەند رۆژەکی پیستەکەی لۆ غاراند حازری کرد لە دوکانی خۆی لەبەر کورەکەی کرد قەسابەکە تەماشای کرد نەیزانی زەلامە هەر وایزانی بزنە ئەوجا بە کورەکەی گۆت ئەوەش پیستەکەت خێری لێ ببینی، کورەکە پیستەکەی هەرگرت هات سبەینە بوو لەکن باخچەی مارێ پاشای خۆی خافراند هەتا شوانەکە بزنەکانی ماری پاشای بەردا بردی لۆ لەوەرانێ لەناو غاباتەکی کورەکە فکری کرد گۆتی ئەمن لەگەر ئەو بزنانە هەتا ئێوارێ ئیدارە ناکەم وا چاکە خۆم راگرم هەتا ئێوارێ کە شوانەکە بزنەکانی هێناوە لۆ مارێ پیستەکەی لەبەرکەم خۆم بەگەر بزنەکانی شوانەی بدەم هەتا دەمانباتە ژۆرێ وەکی چووینە ژۆرێ ئەوجا بەخۆم ئەو وەختی دەزانم چی دەکەم، ئێوارێ شوانەکە بزنەکانی هێناوە ئەویش دیارە غابات بووە داروبار بووە- شوانەکە هەستی پێ نەکردییە، پیستەکەی لەبەرکرد چووە ناو بزنەکانی پاشای هەتا چوونە ناو حەوشەی ماری پاشای- شوانەکە دەرکەی پێوەدا و بزنەکانی داکرد، دیارە هاوین بووە، لۆیە لە حەوشەی کرد، دەرێ کە شەو بە نیوە بوو، هەموو نووستن پیستەکەی لەبەرکردەوە بەسەر قاندرمەیکەت، مارە پاشایە، چەند حەرەسی لە دەرەوە هەیە دەرکەی ژۆرێ کلیل نادەن دەرێ گەرا لە ژۆرەکان هەتا قاسەکەی دیتەوە تەماشای



کرد قاسەکە کلیلکەش لەسەر دانەخرایە، قاسەکەی کردەوە ئەوجا بەخۆی دەزانی چەند پارەی دەرینا هاتەوە خۆی حەشاردا لەناو بزنەکان هەتا سبیانێ کە وەختی شوانەکە دەهات بزنەکان بەربدا پیستەکەی لەبەرکرد بەگەر بزنان کەت شوانەکە بزنەکانی هێنا دەرێ لە کێندەرێ یەکەم جار خۆی گۆری لەوێ پیستەکەی لەبەرکردەوە شوانەکە نەیدیت ئیحتیادی بەپێی خۆی رۆیشت چۆوە مارێ خاری ئینتزاری دەکرد گۆتی شێری یان رێوی گۆتی خارە ئەمن بتوانم شەرواری لەپێی توو بکەمەوە بێ ئەوەی هەست پێ بکەی شێر دەبی یان رێوی گۆتی: وەڵڵا شێری دەرێ پارەکەی دا دەست خاری پارەکە زۆر بوو ماوەکی زۆری پێچوو ئەوجا پاشا هەستی پێکرد کە پارەی لەناو قاسەی نەمایە دەرێ مندارەکانی هەموو تەنگاو کرد مندارەکان زۆر مشەوەش بوون کێ دێتە مارێ پاشای کێ توانیتی بێتە ماری پاشای کەس ناتوانی بێتە ماری پاشای مندارەکان زۆریان لە قەلب ناخۆش بوو، مەعنای پارەکە بە ملەوان دادێ، دەرێ سوندیان خوارد لۆ بابیان کە ئەوان قاسەیان نەکردیتەوە، پاشا فکری گۆرا گۆتی ئەوە دزەکی زۆر مهیم بووە، بزانە بە چ رێگایەکی هاتیتە مارێ مە، دەرێ سبیانێ پاشا هەموو وەزیرەکانی خرکردەوە دانیشتنی لەگەر کردن وە سوندی دان کە ئەو شتەی پاشا باسی دەکا براونەبێتەوە بەس بەخۆیان بزانن سوندیان خوارد کە ئەو باسەی پاشا دەیکا کەس لە هیچ جێگایەك باس نەکا هەتا لە ماری خۆشیان، دەرێ پاشا باسەکەی کرد هەموویان سەریان سورما کە ئەو کارە کوو ئەنجام درایە ماری پاشای هەر چاردەوەی پاسەوانە کەس ناتوانی بچیتە ماری پاشای، پاشا گۆتی وەرن رێگایەك ببینینەوە لەبۆ گرتنی ئەو دزەی، وەزیرەکان گۆتیان پاشا ئەو کابرایەی ئەو دزییەی کردییە سەت لە سەت پارەکەی سەرف بکا یان خەلاس بی دێتەوە لەبۆ دزییەکەی، هەموویان بریاریاندا کە قاسەکەی پاشای بیننە دەرێ خەندەکەکی بکەن (٦-٧) مەتر قۆڵ بی لە ناوەندی قۆرتەکەی قاسەکە دانێن وە قۆرتەکەی پر بکەنەوە بە قیر گۆتیان نەبادا ئەو دزانە دوو سێ کەس بن یەکدی راکێشنە دەرێ نەجاتیان ببی برۆن، ئەو کاتی کورەکە و خاری پارەکەیان خەلاس ببوو، خاری گۆتی: کورم نەچین

هەندە پارە لە قاسەی پاشای بینین گۆتی بەرێ خارە دوو رۆژی دی دەچین قاسەکەی پاشای دەبینین گۆتی: لۆ دوو رۆژی دی گۆتی تەدارەکی توو حازر نییە هەتا لۆت حازر دەکەم گۆتی: چییە گۆتی ئەو کاتی دەزانی چییە هەستا کوڕەکە رۆیی بزنەکی وەك خۆی کڕی بردییە لای قەسابەکەی لۆ خاریشی دروست کرد هاتەوە ماریێ خاری تێگەیاند خاری سەری سوڕا لەو وەزعەی کە خوارزایەکەی دەیکا کارەکەیان ئەنجامدا وەکو جاری دی هاتن لەگەر بزنەکانی ماری پاشای چوونە ژۆرێ بووە نیوەشەو پیستەکانیان دانا کوڕەکە تەماشای کرد ئەوە قاسەکەی پاشای لە دەرێیە گۆتی خارە ئەوە قاسەکەی پاشایە خۆت تەنگاو مەکە وا دەچم قاسەکەی دەکەمەوە پارەکەی دەبنم خاریشی خۆی زۆر بە دزەکی موهیم دەزانی گۆتی نابی ئەمن دەچم دەرێ خاری کە چوو کەتە ناو قۆرتە قیرەکەی قیرگرتی دەرێ کوڕەکە زۆر هەوڵێدا خاری پێ نەجات نەدرا ئەویش نەیوێرا بچیتە ناو قۆرتەکەی کە پارەکەی بینی گۆتی خارە عیلاج چییە گۆتی کوڕم عیلاج ئەوەیە سەرم ببڕە سەلکەکەم لە بۆ خارۆژنت ببەوە هەتاکو سبیانێ ئەگەر لاشەکەشم دەرینن نەمناسن، ئەمن رۆیشتم با ئەتوو نەڕۆی لەگەر خارۆژنت کەیفی خۆتانە سەری خاری بڕی سەلکەکەی لەناو گوشەکەی نا هاتەوە ناو بزنان خۆی شاردەوە هەتاکو سبیانێ کە شوانەکە هات بزنەکان بەربدا خۆی بەگەر بزناندا هاتە دەرێ لاشەی خاری بەجێما، دەرێ پاشا کە سبیانێ هەستا تەماشای قۆرتەکەی کرد دیتی خینەکی زۆر لەسەر قیرەکەی وەستایە زۆر کەیف خۆش بوو گۆتی ئەوە دزەکەمان گرت بەو سبەینەی خەبەری هەموو وەزیرەکانیدا، هاتنە ماری پاشای بەو شەرتەی دزەکەی دەربینن زەلامیان هینا هەموو ئەسبابەکیان هینا لاشەکەیان دەرینا، تەماشایان کرد سەری پێوە نییە، ئەو زەلامەی کوو بناسن کەس نایناسی مناقەشەی زۆریان کرد کە ساحێبی بیبیننەوە تەگبیریان کرد ئەو لاشەیە ئی ئەو شارەیە کانییەك هەبوو هەموو شار ئاویان لەو کانییەی دەینا گۆتیان لاشەکەی ببەنە سەر کانی دابنێن ساحێبی ئەو لاشەیەی دەزانی کە ئەو کابرایە نەهاتتەوە یان فەوتایە یان گیرایە یان کوژرایە دەیناستەوە، ئەو ژنانەی کە لەسەر کانییێ دێن ئاوی ببەن



خاوەنەکەی کە چاوی پێکەوت دەگریێ وەکی گریا بیگرن ئاشکرا دەبی ئەو زەلامە کێیە، بێینەوە سەر خوارزایەکەی کە سەری خاری هیناوە ماریێ گاسی خارۆژنی کرد گۆتی خارۆژن هیچ گریان و داد و فیغان چارەمان ناکە ئەوە سەری خارمە هینایتمەوە بە زمانی خۆی گۆتی سەرم ببڕە سەرم لۆ خارۆژنت ببەوە ئەتوش وەرە ژنی چاك بە هەتاکو لاشەکەی خارم دەینمەوە یان دەدزمەوە هیچ مەکە هەرچی ئەمن پێم گۆتی بیکە، گۆتی فەرموو کوڕەکە گۆتی ئەوە لاشەکەی خارم لەسەر کانی ئاویان دانایە هەر ژنەکی لەسەر ئەو لاشەی بگریێ یان بریێ وەی چاوم کۆرە بی، پاسەوانی دانایە دەیگرن ئەویش وەکی خارم سەردەبڕن، تەگبیرەکت لۆ دەکەم ئەگەر چوویە سەر کانی خۆت پێ رانەگیرا بشگرییێ وەدەکەم پاسەوانەکان نەتگرن خەراتیشت بکەن گۆتی کوو گۆتی ئێستا دەچمە بازاڕی دوو جەرەی ئاوێ لۆت دەکڕم برۆ لۆ کانی لەو سەرەی وەکی چووی چاوت بچوقێنە خۆت رابگرە هیچ مەگریێ وەکی جەرەکانت پڕ ئاو کرد گەڕایەوە لەکن لاشەکەی خارم گوریسەکە شل بکە هەتاکو جەرەکان بەردەبنەوە دەشکێن بە فێری جەرەکان لەکن لاشەکەی خارم دانیشە لۆ خۆت زۆر بگریێ، پاسەوانەکان دێن سوئالت لێ دەکەن ئەتوو لۆ دەگرییێ بریێ وەڵڵاهی ئەمن پیاوەکی زۆر خراپم هەیە ئەو دوو جەرەیەی تازە کڕییە ئەوە جەرەکان شکان بچمەوە هەر دەمکوژی لۆ جەرەکان دەگرییێم ئەو کات پاسەوانەکان پارەت دەدەنێ یان جەرەت لۆ دەکڕن دەرێ چوو وای کرد پاسەوانەکان گۆتیان جەرەکانت بە چەند کڕییە هەتا پارەکەت لۆ خڕکەینەوە پێش ئەوەی بچیەوە ماریێ جەرەکان لە بۆ خۆت بکڕەوە هەتاکو پیاوەکەت نەزانی، ژنەکە گۆتی: ئەرێ وەڵڵا زۆر مەمنونتان دەبم کە ئەمنتان نەجات دا پارەکەیان خڕکردەوە دایانە دەست ژنەکەی گەڕاوە ماریێ کوڕەکە گۆتی: ها خارۆژن قسەکانم کوو بوو گۆتی: قسەکانت زۆر تەواو بوو کووی گۆتت ئەوها بوو ئەوجا گۆتی: خارۆژن سەبرەکەم لێ بگرە هەتا لاشەکەی خارم دەدزمەوە کوڕەکە هەستا چوو کەرەکی بە جاشکەوە کڕی، کەرەکەی هیناوە ماریێ جاشکەکەی بەستاوە کەرەکەی برد لە رێییێ بەرەڵڵای کرد هاتەوە کن جاشکەکەی ئەوجارە دوورتری

خستەوە بەریدا دیسان هاتەوە کن جاشکەکەی ئەو جارە بردبییە سەرکانی کن لاشەکەی خاری لەوێ بەریدا دیسان هاتەوە مارێ کن جاشکەکەی تەدربیەکەی تەواو بوو ئەوجا هاتەوە گۆتی خارۆژن ئەوشۆ قەبرەکی حازر بکە لە ژۆرێ لۆ خارم کە لاشەکەی خارم گەیشتەوە مارێ لە قەبری نێ بیشارەوە گۆتی: باشە، دەرێ دەستی بە قەبر لێدان کرد کوڕە هەستا بەرگەکی دڕای لەبەرخۆ کرد دەفەکی پەیا کرد سمێر و ردێن و پرچەکی سپی زۆر جوانی لە بۆخۆی دروست کرد هەندەك جۆرك و گوش لەسەر پشتی کەرەکەی قەیم کرد پاش عەسرەکی تاخیر بەرەبەری رۆژئاوای هات لۆ لای کانی لۆ کن پاسەوانەکان، گەیشتە کنیان سەلامی لێکردن پاسەوانەکان بەخێرهاتنیان کرد گۆتیان مام دەروێش ئەوشۆ لای مە بمینێوە ئەمە زۆر ئاجز بووینە چەند رۆژە لێروکانەین، چەندی دەرێ پارەت دەدەینێ گۆتی: ناوەڵڵا لێرە نابم خۆی گران کرد گۆتی ئەمن ئەو کەرەم پێیە ئەگەر شەوێ دەعبا کەرەکەمی خوارد گۆتیان بابە پارەکەی کەرکەشت دەدەینێ گۆتی باشە دەرێ شەو لەلایان ماوە دەستی بە دەفە لێدانێ کرد زۆری دەفە لۆ لێدان هەتا هەموویان لە خۆشیان خەویان لێکەوت، دەرێ مووس و کەرەستەی حازر لەکن بوو هەستا یەك و لا سمێری پاسەوانەکانی تراشی لا سمێرەکی خۆشی تراشی وەچوو لاشەی خاری لە کەرەکەی قایم کرد کەری بەردا کەرەکە جاشکی لە مارێیە هاتەوە لۆ سەر جاشکەکەی قەبریش حازرە، کاتەك خارۆژنی چاوی پێکەت کە کەرەکە هاتەوە لاشەکەش وا لەسەر پشتی قایم کرایە لاشەکەی کردەوە لە قەبری نا شاردیەوە کوڕەکەش لەکن پاسەوانەکان پاری داوە دەرێ سبیانێ زوو هەستا تەماشایان کرد لاشەکە نەمایە و کەرەکەش نەمایە و دەروێشیش وا نووستییە تەماشای یەکیان کرد یەك و لا سمێریشیان نەمایە تەماشای کرد دەروێشیش لا سمێرەکی نەمایە گۆتیان دەروێش بەجێی خۆی بەس پاشا هەمووەمان ئیعدام دەکا چ جوابی پاشای بدەینەوە گۆتیان با دەروێش بەرێ بکەین ئەمەش لۆ خۆمان هەربێین نەوەکو پاشا بمان بینی، دەروێشیان بەرێ کرد و بەخۆشیان هەراتن دەروێش هاتەوە مارێ وەکی هاتەوە خارۆژنی لاشەکەی خاری شاردبۆوە ئەوجا پێی



گۆ ئەوەش لاشەکەی خارت. دەرێ پاشا خەبەری وەرگرت کە لاشەکە نەمایە و پاسەوان نەمایە هەستی کرد ئەو لاشەیە دزەکە نییە، یەعنی دزەکە هەر مایە ئەوجا کوڕەکە دەستی بە دزییەکی زۆر پیس کرد لەو شارەی شارەکەی تاران کرد، ئەو هەموو خەرکە هەموو رۆژێ شکایەت و شکایەت کاری لەلای پاشای، شاری لە زەواق نا پاشا شێت بوو رۆژەك گاسی وەزیرەکانی کرد، گۆتی: وەرن چارەی گرتنی ئەو دزەی کوو دەبی ئەوانیش گۆتیان پاشا خەرکی لەو شارەی هەموو خڕکەوە لە فرانە ساحەی دزەکەش لەگەر ئەو خەرکەی لەوێ مەوجودە قسەیان لۆ بکە عەفووەکی چاك بدە ئەو دزەی وە معاشەکی باشی لۆ بەیانکە وە کیژی خۆشتی بدێ بەس واز لەو دزییەی بینی، پاشا هەستا ئەو خەرکەی هەموو خڕکردەوە قسەی لۆ کردن دوایی گۆتی: هەر کەسەکی ئەو دزەی ببینتەوە کیژەکەی خۆمی دەدەمێ و خەراتیشی دەکەم پلەکی زۆر گەورەشی دەدەمێ، دەرێ کابرایەك هاتە دەرێ(جوو) بوو، نجوم گرەوە بوو هاتە دەرێ گۆتی: پاشا ئەمن ئەو دزەی دەبینمەوە تەسلیمی تووی دەکەم، بەو شەرتەی مەرجەکانی توو بێتەجێ، جووەکە خمچی بوو خمی دەکرد دەرێ کوڕەکە لە دری خۆی گۆتی: دەبێ ئەو جووەی بفەوتێنم لەبەرئەوەی ئەوە نجوم گرەوەیە نەبادا ئاشکرام بکا پاشا لەسەرم بدا، دەرێ عالەمەکە پەرتەی لێکرد هاتنەوە ناوشار و بازاڕ و ماری خۆیان، ئەویش (کوڕە دزەکە) دوو سێ مەتر تولەی سپیی کڕی، وەختی عیشایێ چوو لە دەرکەی مارێ جووەکەی دا، جووەکە هات گۆتی: کێیە؛ گۆتی: خۆمانین کاروانچیمە سبیانێ زوو دەگەڕێینەوە خێرت دەگاتی ئەو دوو سێ مەتر تولەیەم لۆ لەخم بدە ئەویش جوابی داوە پێی گۆت: من بەو شەوەی دەرکەی ناکەمەوە، کوڕەکە زۆر پاڕاوە دەرکەی نەکردەوە لە پاشان کوڕەکە پێی گۆ مادام دەرکەی ناکەیەوە دەستت بینە لە کونی دەرکەی تولەکەت دەدەمێ، جووەش گۆتی باشە جووە دەستی لە کونی دەرکەی هینا دەرێ کە تولەکەی لێ وەرگرێ کوڕەکە توند دەستی گرت رایکێشا هەتاکو پیلی جووەی هەموو لە کونی دەرکەی هینا دەرێ لەبن را قۆری بڕی قۆرەکەی لە تولەکەی لولدا و رۆیی جووەش لەودیوی بەربۆوە سبیانێ چەند بەیتاریان

هینا سەر جووەی قۆری جووەیان تیمارکرد جووە کەت لە ماریێ ڕۆژی دواتر کوڕەکە
کەورە بزنەکەی خۆی هێنا ڕۆیی لۆ سەر ڕێگای شوانەکەی پاشای کەورەکەی لەبەرکرد
بەگەر بزنەکانی پاشای کەت هەتا شوانەکە لە ژوریێ ماری پاشای کردن شەویێ درەنگ
کەورەکەی لەبەرکردەوە دەیزانی هۆدەی کیژەکەی پاشا لە کێیە بەسەر قادرمان کەت
هەتاکو چووە کن کیژەی پاشای تەماشای کرد کیژەکە خەوی لێ کەتییە، دانیشت
لەلای هەتاکو کیژەکە خەبەری بۆوە، کە تەماشای کرد زەلامەك کوڕەکی قۆزە وا
لەلایی دانیشتییە، لەسەرەخۆ پرسیاری لێکرد گۆتی: ئەتوو چیی کوڕەکە جوابی داوە
گۆتی: ئەمن هاتیمە چەند پرسیارەکت لێ بکەم بە گفتوگۆیەکی خۆش جوابم بدەیەوە
وە ئەتوش هەر پرسیارەکت لێ کردم وەڵامت بدەمەوە، کیژەکە گۆتی: فەرموو کوڕەکە
گۆتی: تۆ کیژی پاشای ئەو شارەی ئایا ئەتوو ڕازی بابت بتداتە جووەکی پیس خمچی
کیژەکە گۆتی: نەخێر، من ڕازی نابم، کوڕەکە گۆتی: بابت بەشەرت مەرجی دانایە
هەر کەسەکی ئەو دزەی ببینێتەوە تۆی بداتێ وە پلە و پاداشتەکی باشی بداتێ،
کیژەکە گۆتی قەیناکە بەس جوو نەبی هەر کەسەکی دی بی، مادام بابم مەرجی لۆ
دانایە من ڕازیم، کوڕەکە گۆتی: ئێستا تۆ ئەمن باش دەبینی، کیژەکە گۆتی: بەرێ
یەعنی ئەگەر بەخۆت دزەکەی ببینیەوە وە تەسلیمی بابتی بکەی با پلە و پاداشتەکە
لۆ تووبی باشترە، کیژەکە گۆتی: ئەوجا من ئەو دزەی لە کێ دەبینمەوە کوڕەکە
گۆتی: من دزەکەت لۆ دەبینمەوە ڕازی دەبی کیژەکە گۆتی بەرێ، کوڕەکە گۆتی:
وەرە سوێندم لۆ بخۆ هەتاکو سبیانێ دەنگ نەکەی پێت دەرێم، کیژەکە گۆتی شەرت
دەنگ ناکەم کوڕەکە گۆتی: من دزەکەمە، کیژە سەری سوڕما گۆتی ئەتوو کوو
دزەکەی، کوو گەیشتیتە ئێرە، ئەویش باسەکەی لۆ کرد کە بەو عارە گەیشتیتە ئێرە
کیژەکە گۆتی بە شتەك لۆم ئیسپات کە کە ئەتوو دزەکەی من قەناعاتی پێ بکەم
کوڕەکە هەموو سەربردەکەی لۆ گێڕایەوە، ئێستاکەش لەسەر شەرەفی توو خۆم
تەسلیمی توو کرد، کیژەکە زۆر کەیف خۆش بوو، وە ماوەیەك پێکەوە دانیشتن
کوڕەکە داوای لە کیژەکەی کرد کە بچیتە ئاودەست لۆ دەفع کردنی حاجەتی خۆی



کیژەکە پێی گۆت نەخێر ڕێگەت نادەم بچیتە ئاودەست نەبادا هەربێی کوڕەکە گۆتی:
باشە، کوو دەتوانم ڕابکەم ئەوە هەر چاردەوری ماری بابت پاسەوانە ئەگەر دەترسێی
عەبلەکی بینە لە دەستم بێخە هەتا دەچمە ئاودەست و دێمەوە، کیژەکە ڕازی بوو
گۆتی باشە، کیژە عەبلەکی درێژی هینا لە دەستی کوڕەکەی گرێدا، کوڕەکە چووە
ئاودەست و عەبلەکەی لە دەستی خۆی کردەوە قۆری جووەکەی دەرینا عەبلەکەی لە
قۆری جووەکەی قایم کرد لەسەرەخۆ هاتە دەرێ بێ ئەوەی کیژەکە هەست پێ بکا
هاتەوە خوارێ پیستە بزنەکەی لەبەرکرد چۆوە ناو بزنەکانی پاشای، کیژەکە هەستی
کرد کە ماوەکی زۆرە ئەو کوڕە نەهاتەوە عەبلەکەی ڕاکێشا گران بوو وایزانی هەر
ماوە ماوەکی دیکەی پێچوو هەر نەهاتەوە عەبلەکەی ڕاکێشا گرانابیەك هات هەر
ڕایکێشا هەتاکو قۆری جووەی گەیشتە پێش دەرگای کیژەکەی، کیژەکە تەماشای کرد
ئەو کوڕەی لەلای دانیشتبوو دەستی بە خم نەبوو ئەو دەستە وا بە خمە کیژەکە زۆر
تەحەجوبی ما هاتە دەرێ چووە ئاودەستێ تەماشای کرد کەسی تێدا نییە ئەو زەلامە
چووە کێ گۆتی وا چاکە دەنگ نەکەم هەتا سبیانێ کە سبیانێ هەستان دانیشتن
گۆتی بابە خەبەرەکی زۆر خۆشت بدەمێ گۆتی: فەرموو کیژم گۆتی من ئەوشۆ
دزەکەم گرت، پاشا لە کەیفا زۆری پێ خۆش بوو گۆتی، فەرموو پێم برێ چۆنت گرت،
گۆتی بابە دزەکە بەخۆی هاتە لای من دانیشت ئیسپاتی کرد کە ئەوە دزەکەیە،
دوایی من قۆرم بەستا بەسەرهاتی دزەکەی کە شەوێ کوو هاتە لای هەموو گێڕاوە،
دوایی گۆتی بەستامەوە لە پەنجەرەی دیارە زۆری هەوڵدایە بەرببی قۆری لەبن ڕا لێ
بوویتەوە قۆرەکەش وا لە هۆدەی منە پاشا گۆتی بڕۆن قۆرەکەی بینن کە قۆریان هێنا
پاشا تەماشای کرد ئەو قۆرە هی جولەکانە ئەوە خمچییە، ئەمری کرد هەرچەند جوو
لەو شارەی هەیە خڕیان کەنەوە ئەوەی قۆری نەبی مەعنا دزەکەیە جوویان خڕکردەوە
پاشا هات ئەو جووەی کە نجوم گرەوە بوو بە پاشای گۆت دزەکەت لۆ دەبینمەوە ئەوە
قۆرەکی نەمایە، ئەمری کرد جووەکان بڕۆن بەس ئەو جووەی هێشتەوە هینایەوە
ماریێ گۆتی جووە وەرە پێم برێ لۆ قۆرت بڕایە، دەرێ جووە بەسەرهاتەکەی گێڕاوە لۆ

پاشای، پاشا دڵنیا بوو کە جووە دز نییە، وە دزەکە هەر مایە پاشا گاسی وەزیرەکانی کرد باسەکەی هەموو لۆ گێڕانەوە، وەزیرەکان گۆتیان پاشا مادام چەند سەعاتەك ئەو دزە لەگەر کیژەکەت دانیشتییە دەبی کیژەکەت بیناستەوە، پاشا لە دوو کیژەکەی نارد پێی گۆ کیژم ئەتوو ئەو کوڕەی دەناسیەوە، کیژەکە گۆتی: بەرێ بابە دەیناسمەوە پاشا گۆتی سبیانێ ئەمرەکی دەرکرد کە کەس نەچتە دەرێ لەو شارەی ئەوەی عومری لە (١٤) ساری زیاترە نابی لە مارێ بمینێ ئەگەر بێتوو بگیرێ لە مارێ لەسەری دەین، دەرێ عالەمەکەی هەموو لە ساحەی خڕکردەوە، کیژەکەی لەگەر خۆی برد قسەی لۆ عالەمەکەی کرد گۆتی ئەوە کیژی منە دزەکەش دەناسی هیچ ماندیمان نەکا ئەمن لەسەر مەرجەکانی خۆم ماوم پەشیمان بوونەوەی نییە، ئەوجا با زوو خۆی ئاشکرا بکا دزەکە هاتە دەرێ رۆیی لۆ لای پاشای گۆتی فەرموو پاشا ئەمن دزەکەم ئەمریدا عالەمەکە بڕۆن، عالەمەکە پەرتەیان کرد وە پاشا دزەکەی لەگەر خۆی هیناوە مارێ، وە کیژەکەی دایێ پلە و پاداشتەکی باشی دایێ داینا لەلای خۆی گۆتی بەس ئەمن ئیشەکم بە تووە ئەگەر پێت دەکرێ ئیشەکەم لۆ بکەی، کوڕەکە گۆتی: فەرموو برێ گۆتی: کوڕم ئەو پاشایەی فران شاری ئەوە چەند کاغەزم لۆ بنێری وەکو قەشمەری کردن، قەشمەریم پێ دەکا دەرێ ئەتوو یەك دزت پێ ناگیرێ، دەمەوێ بچی دزییەکی لەو پاشایەی بکەی، کوڕەکە گۆتی: دزی لێ ناکەم بەس شەرتبێ لەسەر دەستی توو دەبی نەفسی پاشای بدزم بیهێنمەوە لای توو، پاشا سەری سوڕما گۆتی ئەتوو کوو پاشای دەدزی، کوڕەکە گۆتی: ناتەوێ لۆت بدزم، گۆتی: باشە، دەرێ کوڕەکە هەستا رۆیی چووە شارەکەی چووە لای مارێ پاشای لۆ تاقیب کردنی پاشای، تەماشای کرد کە رێوشونەکی دابنێ کوو بگاتە پاشای، دەرێ تەماشای کرد پاشاش وەکو پاشای خەزوری ئەویش برە بزنەکی هەیە شوانەك لە لایتیبیان، کوڕەکە گۆتی: لەوەی ئاسانتر نابی ئەوا مەعنای من پاشام دزی، دەرێ پیستە بزنەکەی هینا دەرێ و لەبەرەخۆی کرد بەگەر بزنی پاشای کەت وە شوان لە ژورێی کردن، شەوێ بەسەر قاندرمەی کەت لە غورفەی پاشای پاشا خەوی لێ کەتبوو خۆی هاوێشتە سەر



سینگی پاشا پاشا بەخەبەر هات تەماشای کرد ئەوە بزنەك وا لەسەر سینگێتی پاشا گۆتی: ئەتوو چی، بزنەکە گۆتی: من حەزرەتی قابیزم هاتیمە روحت بکێشم گۆتی حەزرەتی قابیز بە قوربانت دەبم نیو سەعاتم ئیزن بدە مار و مندارەکەی خۆم ببینم، گۆتی: ئیزندان نییە، ئێستا روحت دەکێشم، گۆتی: بە قوربانت دەبم بە زیندییەتی چاوان روحم مەکێشە لێم گەڕێ (١٠) دەقان بنووم گۆتی بنوو، پاشا لە ترسان خەوی لێکەت ئەویش هەستا پاشای بە یاتاغی خۆی پێچاوە و بە عەبلەکی، باش پاشای پێچا، پاشا لە ترسان نقەی ناکا بەرگەکەی پاشای لەبەرکرد، هاتە خوارێ و پاسەوانەکان سەیریان کرد ئەوە پاشا بەو نیوەشەوە بە تەنیا لۆ هاتە دەرێ، پاسەوانەکانی خڕکردەوە و شەش پاسەوانی هەربژارد پێی گۆتن خۆتان ئامادەکەن بە تەواوی ئێستا دەڕۆین، گۆتیان بەرێ خۆیان حازرکرد، گۆتی وەرنە دووم هاتنە دووی هەتا گەیشتنە غورفەی پاشای ئەمری کرد ئەو یاتاغە هەرگرن یاتاغەکەیان هەرگرت و هەستیان کرد ئەوە زۆر گرانە یاتاغ نییە هینایانە خوارێ- ئەمری کرد لەسەر پشتی وراغەکی قایمی بکەن قەییان کرد بە توندی گۆتی سواربن سواربوون بە پێش کەت گۆتی باژۆن، وەرنە دووم رۆیشتن هاتن هەتاکو نێزیك شاری پاشای خەزووری بوون، ئەو وراغەی کە یاتاغەکەی لێ قایم کرابوو، گۆتی بیدەنە دەستم وراغەکەیان دایێ و ئەمری کرد کە بگەڕێنەوە لۆ ماری پاشای گۆتی ئەگەر سوئالیانکرد برێن پاشا چووە فران شاری هەتا ماوەی سێ رۆژان نایەتەوە گۆتیان باشە، پاسەوانەکان گەڕانەوە چوونەوە شاری خۆیان، کوڕەکە هات هەتاکو گەیشتە ماری خۆی راوەستا پاسەوانەکانی پاشای هاتن بەخێرهاتنیان کرد نەیانزانی کە ئەوە زاوای پاشایە، هەروایان زانی پاشایە، ئەمری پێکردن یەتاغەکەی بکەنەوە بیهێننە خوارێ یاتاغەکەیان هینا خوارێ برندیان کرد بەسەریان خست هەتاکو چوونە غورفەی پاشای گۆتی، داینێن ئەوجا بڕۆن پاسەوانەکان هاتنە خوارێ وە پاشا لە دەوامی خۆی هاتەوە بەسەرکەت تەماشای کرد کوڕەکە دانیشتیە یاتاغەکی لولدرا دانرایە گۆتی ها کوڕم ئەتوو چووی دزیم لۆ بکەی، یان یاتاغم لۆ بدزی گۆتی فەرموو مامە بیکەوە، کە

کردیەوە تەماشای کرد پاشای شارەکەیە وا چاوی لەسەریەك دانایە، هەستی راگرتییە بزانی چی لیّ دەکەن گۆتی: حەزرەتی قابیز توخوا بە سەبر هیچ ئەزیەتم مەدە روحم بکێشە، پاشا پێکەنی گۆتی: روح کێشانی چی هەستە من پاشای فران شارم ئەوە دزەکە هی منە کە چەند نامەکت لە بۆ من دەنارد بە قەشمەری دەتگۆ دزەکت پیّ ناگیریّ، گۆتی: بە قوربانت بم بە راستی دزە ئەوە نەك بە تووە بە بابی منیش ناگیریّ، گۆتی: کورِم ماوەی چەندت لۆ دانایە کە بگەرِێتەوە شاری خۆی، گۆتی مامە ماوەی سیّ رۆژم لۆ دانایە کە لەگەر توو بمینێتەوە وە ئێمەش خزمەتی بکەین وە لە دوای رەوانی بکەینەوە، دەریّ سیّ رۆژەکە تەواو بوو، پاشا ئەمری کرد بە چەند پاسەوانەکی خۆی پاشای رەوان کەنەوە وە کورِەکەش لەگەر رەوانە بکا لە بۆ شارەکەی پاشای، دەریّ پاشایان هینا بەرگی خۆی لەبەریان کرد سواریان کرد، بەگەری کەتن هەتاکو گەیاندیانەوە شار، پاشا زۆری هەولّدا کە کورِەکە لەلای بمینێتەوە، بەلاّم کورِەکە سوپاسی پاشای کرد، گۆتی: ناتوام بمینێمەوە ئەوجا پاشا سبیانیّ گاسی هەموو وەزیرەکانی خۆی کرد، باسی ئەو دزەی کرد، کە کوو پاشای دزی لە شاری خۆی هەتا فران شاری وە بووە دەنگوباس لەو شارەی لەسەر ئەو دزەی کە دزەکی تەواوە.

-------------------------------------

* ئەم هەقایەتەم لەسەر زاری بەرِێز: مەحموود خدر محەمەد کە تەمەنی ٥٣ ساڵە و، لە هەولێر دادەنیشیّ وەرگرتووە

* لە گۆڤاری کاروان ژمارە ١٧٢ ساڵی ٢٠٠٣ بلاّوم کردۆتەوە

# دوو برا

هەبوو نەبوو کەس لە خوای گەورەتر نەبوو، دوو برا هەبوو بە ناوی شێخ محەمەد و جەمیل پاڵەوان، جەمیل پاڵەوان برای گچکە بوو هەر چەندە برێی جوان بوو، خزمەتکارێکیان هەبوو ناوی سەعید بوو، برای گەورە گۆتی: دەچم لۆ حەج، رۆیی، ژنەکەی خۆی جوان دەرازێنێتەوە دەچێتە لای جەمیلی پێی دەرێ دەبێ شتەکی وام لەگەر بکەی، جەمیل دەرێ باشە دەچی حەفت حەیزەرانی دەینی و لە یەکی دەبەستی دەست دەکا بە لێدانی براژنەکەی هەتا هەر حەفت حەیزەرانەکە دەشکێ، چیتر ناچێتە لای، برای گەورە لە حەج دەگەڕێتەوە خەرك هەموو دەچنە لای تەنها جەمیل ناچی، ژنە بە درۆ دەرێتە پیاوەکەی کاتی ئەتوو رۆیشتی لۆ حەج جەمیل وای پێ گۆتم بەران من رازی نەبووم، شێخ محەمەد بە قسەی ژنەی بڕوا دەکات، پاش چەند رۆژەك (٦٠٠) لیرەیان دەبێ لەگەر خۆی دەبا و دەچێتە لای جەمیلی و پێی دەرێ لۆ نەهاتیە کنم، ئەویش دەرێ ئیشم هەبوو، لە (٦٠٠) لیرەکە (٣٠٠) لیرە بە جەمیل دەدا و دەرێ با بچین لۆ راوێ جەمیل لەگەری دەڕوا، لە رێیێ لیرەکان هەریەك بەجیا لەبن خۆرێ دەنێن، ماوەیەك دەڕۆن دەگەنە بیرەکی، سەیری بیرەکە دەکەن، لەناکاو محەمەد پاڵێك بە جەمیل وەدەنێ و دەیخاتە ناو بیرەکە و دەگەڕێتەوە و (٣٠٠) لیرەکە دەردەهێنی و دەچێتەوە مارێ، جەمیل لەناو بیر دەست دەکا بە دوعا و دەرێ: خودایە بەخۆت دەزانی هیچ گوناهم نییە، چەند رۆژەکی پێ دەچێ کاروانێك بەوێدادێ لا دەدەنە سەر بیرەکە، دۆلکەی شۆڕ دەکەنەوە، جەمیل توند دۆلکەکەی دەگری و دەرێ خێرتان



دەگاتێ دەرم بێنن، ئەوانیش دەری دێنن و لێی دەپرسن لۆ کەتیە ناو بیرێ، ئەویش نارێ برام منی هاوێشتە ناو بیرێ، دەرێ ویستم ئاوێ دەربێنم کەتمە ناوی، دەرێن با لەگەرمە بچین، دەرێ نایەم، جەمیل دوعابوونیان لێ دەخوازی و دەگەڕێتەوە لای لیرەکان، دەبینی (٣٠٠) لیرە مایە و ئەویدیشی بردووە، دەڕوا دەچێتە چەند گوندەکی کەس نەیدەکردە شوان و خزمەتکار چونکە بەرگی ئاغایەتیی لەبەربوو، لە دەشتی خۆیان زۆر دوورکەوتەوە تەیرەك دێتە لای و دەرێ ها چ دەکەی لێرە، دوو پەڕی خۆی داییێ و گۆتی: ئەم پەڕەی بابدەی هاتەك دەبێ گیا دێتە چۆکان، ئەو پەڕەش بابدەی ماینەك دێ بە شیر و بە تەواوی، پەڕەکانی هەرگرت و رۆیی چووە لای شوانەکی پێی گۆت ئەم بەرگەی خۆمت پێ دەدەم و لەگەر (١٠٠) لیرە ئەتووش کاوڕەك و بەرگی خۆتم بدێ شوانە گۆتی: ئەتوو ئاغەی لۆ گاڵتەم پێ دەکەی، گۆتی شەرت پێ گاڵتەت پێ ناکەم (١٠٠) لیرەشت پێ دەدەم، شوانە بڕوای کرد و بەرگی خۆیان گۆڕییەوە و (١٠٠) لیرەی وەرگرت، جەمیل کاوڕەکەی سەربڕی و کەوری کرد و پێستەکەی لەسەری خۆی نا و کەلەشەکەشی داوە شوانەکە، جەمیل خۆی کرد بە کەچەر رۆیی چووە شارێك لەوێ چووە ماری ئاغا، هەتا سێ رۆژی پێ چوو پرسیاریان لێ نەکرد لە پاش سێ رۆژان، لێیان پرسی ئەتوو چت دەوێ، جەمیل گۆتی: دەمەوێ کارەکی بکەم، ئاغاش زگی پێ سوتا و کردییە سەرپەرشتکاری شوانان، ساری دوایی لای ئەوان دەبتە نەهات، شوانەکان دەڕۆن لۆ جێیەکی دیکە، مەڕە شەل و لەڕوو پیرەکان لەکن جەمیل دەهێڵنەوە، جەمیل دەیبردنە دەرەوە بەران هیچ نەبوو بخۆن، رۆژەك جەمیل پەڕەکانی بەبیر دێتەوە پەڕی دەردەینی و بای دەدا، دەبیتە بەهارێك گیا لە چۆکان دەبی مەڕەکان تێر دەخۆن، هەموو رۆژ بەو جۆرە بەران دەنگ ناکا، زۆر قەرەو دەبن ئاغا سەری سوڕدەمینێ دەرێتە جەمیلی کەچەر ئەتو چییان دەدەیێ لەو دەشتە هیشکە هیچ نییە بخۆن و هەر قەرەویش دەبن، کەچەر دەرێ، پووشی هیشك ساری دواتر دەبیتەوە هات شوانەکان هاتنەوە و دەبینن لەڕوو پیر شەلەکان لەهەر ئەوان قەرەوترن ئەوانیش سەریان سوڕما، ماوەکی پێ دەچی زۆرداریێك هێرش لۆ شارەکە

دەینی و هەموو مەڕ و ماراتەکەی ئاغا دەبا، هەرچەندی دەکەن ناتوانن مەڕ و ماراتەکە بیننەوە، کەچەر بە دزی پەڕی بادەدا و ماینەك بە تەواوی کەل و پەلی شەڕ دێتە پێشی سواری سەرپشتی دەبی و دەڕوا دەچتە ناو شەڕی و بە شیر هەر سەریان دەپەڕێنی و دەیهینێ لەبن بەردەکی دەنێ، ئاغاش لە مارەوە بە دووربین تەماشا دەکا، پاڵەوانێك زۆر ئازایە هەر سەریان دەبڕی و لەبن بەرد دەنێ، کەچەر هەموویان دەکوژی و تارانی دەینیتەوە و دەگەڕێتەوە جێی خۆی و وەکو جاران بە هەژاری و بێ دەنگ، پاڵەوانەکانی ئاغا بە پێکەنین دەگەڕێنەوە لای ئاغا دەرێن ئاغا تارانمان هیناوە، ئاغاش ئاگادارە، ئاغا دەرێ براینە من بە دووربین تەماشای شەڕەکەم دەکرد پاڵەوانەك هەر سەری دوژمنەکانی دەبڕی و لەبن بەردی دەنا، من خوشکەکم هەیە، دەیدەم بە ئەو، هەریەك لەلای خۆی گۆتی منم، ئاغا پاڵەوانەکانی بردە لای بەردەکە گۆتی لەبن ئەم بەردەیە هەرچی ئەم بەردەی پێ برند بکرێ دیارە ئەوە. ئاغا دەیزانی بەردەکە زۆر قورسە، هەرچەند پاڵەوانەکان. لێی خڕبوونەوە نەیانتوانی برندی بکەن، ئاغا زانی کەچەرە، لۆیە گۆتی: کەچەر وەرە ئەتوش خۆت تاقی بکەوە، کەچەر گۆتی: ئاغا ئەوە لە هێزی من دانییە، منی کەچەر و هەژار کو پێم برند دەکرێ، پاڵەوانەکانیش پێی پێکەنین، گاڵتەیان پێ هات، ئاغا گۆتی: نابێ قسەم بشکێنی دەبی خۆت تاقی بکەیەوە، کەچەر هەر بە دەستێك بەردەکەی برند کرد و بە دەستەکەی دیکە سەرەکانی دەرهێنا هەموو سەریان سوڕما ئاغا بڕیاریدا سبەینێ کەچەر لۆ حەمام ببەن و ئەوجا هەر سبەینێ خوشکەکەمی پێ دەدەم، رۆژی دوای جەمیل دەچێ لۆ حەمام خۆی دەشوا جلکی نوی لۆ دەبەن کە دەگەڕێتەوە تەماشای دەکەن کوڕە گەنجێکی زۆر جوانە زۆریان هەر بڕوا ناکەن کەچەر بەسەرهاتی خۆی دەگێڕتەوە و ئاغا یەکسەر بەرگی خۆی لەبەر دەکاتەوە و کچە زۆر جوان دەبی، خۆی لە جەمیل-ی مارە دەکا، جەمیلی دەکا بە ئاغای شارەکە و لۆ ماوەی سێ سار لەسەریەك سێ کوڕیان دەبێ، جەمیل هەرسێ کوڕەکەی بە بەردەوام فێری پاڵەوانی دەکردن لۆ شەڕ، وای لێدێ هەرسێ کوڕەکەی زۆر ئازا دەردەچن تا جەمیل دەرێتە



کوڕە گەورەکەی چەند کەس پێت ناوەستێ؟ کوڕە دەرێ سەد کەس، کوڕە ناوەنجی دەرێ هەشتا، کوڕە گچکە دەرێ پەنجا، بەران جەمیل بە بەرەدەوام فێری شەڕی دەکردن تا کوڕەکانی پاڵەوانی زۆر باشیان لێ دەردەچێ و ئەوجا دوای دوو ساری دیکە جەمیل دەرێ دەمەوێ سەر لە ماری برام بدەم، هەموویان دەڕۆن، لە شاری دووردەکەونەوە تووشی ئەختیارێك بوون، گۆتی: ها جەمیل لۆ کێ دەچی، دەرێ دەچم لۆ فران شاری، ئەختیار دەرێ شەوان لەسەر گرد و دارستان و نزیك ئاو مەنوون، جەمیل دەرێ باشە، دەڕۆن کاتی ئێوارە تووشی گردێك دەبن، کوڕەکانی دەرێن ئەم شەو لەسەر ئەم گردە دەنووین، مندارەکان دەرێن مام ئەختیار چ لە دونیا دەزانی کەس هەیە بەمە بوەستێ، کوڕەکان و دایکیان دەنوون، جەمیل نانووی، شەو درەنگ دێوێك دێ دەرێ لەت و پەتتان دەکەم ئەوە لۆ لەجێی من نووستینە، جەمیل دەست دەداتە شیر دەکەونە شەڕ لەگەر یەکدا، زۆر یەکدی دەهێنن و دەبەن ئەنجام جەمیل دێوەی دەکوژی و لچی دەبڕێ دەیهاوێتە ناو توورەگە، کوڕەکانیش هەر بەخەبەر نەهاتن، بەیانی لەخەو هەستان و گۆتییان بابە دەتگووت لێرە نەنووین کاخۆ هیچ نەبوو بەران داکیان ئاگادار بوو، نانی دەخۆن و دەڕۆن، جەمیل دەرێ ئەنگۆ بڕۆن من دەنووم شەو نەنووستیمە بەران شەو لەسەر ئاو و ناو دارستان مەنوون، ئەوان دەڕۆن ئەویش دەنوێ لە پاشان هەردەستێ و دەڕوا دەبینی لەسەر رووبارێك دانیشتینە، جەمیل دەرێ کوڕەکانم لۆ لێرە دانیشتینە با لێرە بڕۆین ئەی مام ئەختیار نەیگۆت شەو لە نزیك ئاو مەنوون، کوڕەکان دەرێن جێیەکی خۆشە مام ئەختیار چ دەزانی، لەوێ دەنوون، بەران جەمیل نانووی، شەو درەنگ دەبینی دێوەك دێ دووهەندەی دێوەکەی دیکە، دەرێ دەبی لەت و پەتتان بکەم لۆ لەجێی من نووستینە، جەمیل دەست دەداتە شیر و دەست دەکەن بە شەڕ و زۆر یەکتر دەهێنن و دەبەن ئەنجام، جەمیل دێوەی دەکوژی و لچی دەبڕی و دەیهاوێتە ناو توورەگەکە بەیانی کوڕەکان هەر دەستن و دەرێن بابە کا هیچ نەبوو، بابی دەنگ ناکا دەرێ نا بەران دایکی ئاگای لێ بوو، دیسان جەمیل دەرێ ئەنگۆ بڕۆن من دەنوم شەو نەنووستیمە، کوڕەکان و

دایکیان دەڕۆن و جەمیل دەنوی، لە پاشان لەخەو هەردەستێ و دەڕوا دەبینی لەناو دارستانێك دانیشتینە جەمیل دەرێ مام ئەختیار نەیگۆت شەو لەناو دارستان مەبن، کوڕەکان دەرێن بابە مام ئەختیار چ دەزانی کوا هیچ بوو، لەسەر گرد و لە دەو رووبارەکە شەو لەوێ بووین، شەو دادێ و کوڕەکان لێی دەنوون جەمیل نانوی شەو دەبینی مارەك دێ دەرێ لەت و پەتتان دەکەم لۆ لەجێی من نووستینە، جەمیل هەردەستێ و دەست دەداتە شیر و دەست دەکەن بە شەڕ زۆر ماندی دەبن بەران ئەنجام جەمیل مارەکەی دەکوژی و لچی دەبڕی و دەیهاوێتە ناو تورەگەکە، بەیانی کوڕەکان لەخەو هەردەستن دەرێن بابە کا هیچ بوو، دەرێ نەخێر، هەردەستن و دەڕۆن نزیك گوندەکە دەبن جەمیل دەرێ دانیشین هەموو دادەنیشن بەسەرهاتی رێگایان لۆ دەگێڕیتەوە و لچەکانیشیان پێ نیشان دەدا، دەرێ دەبی ئەنگۆ لێرە بن نابێ لەگەرم بێن هەتاکو من دێمەوە، دەرێن باشە جەمیل دەڕوا دەچێتە ناو گوندەکە پرسیاری ماری برای دەکا، دەرێن شێخ محەمەد پیر بووە و زۆر فەقیرە کاتی خۆی برایەکی هەبوو ناوی جەمیل بوو بە ناهەق بە درۆیەکی ژنەکەی جەمیلی کوشت، لە دوای کوشتنی ئەو سەعید مەڕ و ماراتەکەی هەموو لێستاند سەعید بوویتە ئاغا و چوونە کن شێخ محەمەد هەر قەدەغەیە لۆ هەر کەسەکی بی، تەنها یەك پیرە چێری هەیە لەگەر یەك کوڕی، ماری لە فرانە جێیە، جەمیل دەچێتە ماریان، ئاغا دەزانێ مێوانەك چووە ماریان خزمەتکارەکی دەنێری، بڕۆ با بێتە ئێرە، خزمەتکارەکە دێتە کن جەمیلی دەرێ لۆ هاتیە ئێرە نازانی قەدەغەیە جەمیل گێی دەگرێ و لەبندا دەری دەهێنی، چەندان کەسی دی دەچی گێی دەردەهینا، کوڕی شێخ محەمەد هەر کە جەمیل دەبینی زۆر خۆشی دەوێ دەرێتە بابی، بابە ئەو مێوانەم زۆر خۆش دەوێ با ئەو چێرەی لۆ سەر ببڕین بابی دەرێ کوڕم تەنها ئەو چێرەمان هەیە ئەگەر مارمان باربکەین بەچی بگوازینەوە، کوڕە گۆتی بە شانی خۆم دەیبەم چێرەکەیان لۆ سەربڕی، لە پاشان جەمیل دەچێتە ماری سەعید دەرێ ئاغا سێ سوار لە فران جێیە هاتینە لەناوت بەرن، ئاغا سواران حازر دەکات هێرشیان لۆ دەبەن، شەڕ گەرم دەبی



کوڕەکانی جەمیل شەڕەکی وا دەکەن وەك گەرای پایز هەریان دەوەراندن، داکی جەمیل زانی شەڕە گۆتیە کوڕی شێخ محەمەد وەك جەمیل ئازای، بەران بە تەنیای، جەمیل گۆتی لۆ ناچی لۆ شەڕ گۆتی ماینم نییە، جەمیل ماینی خۆی دایێ چوو لۆ شەڕ دوایی هاتەوە، جەمیل گۆتی شەڕەکە کووە، کوڕە گۆتی بریا ئەوانە برام بوونایە دونیا هیمە دەبوو جەمیل گۆتی: ئەوانە ئامۆزاتن، ئەمن جەمیلم، لەوێ لەگەر داك و برای بەیەکتر شاد دەبنەوە، جەمیل دەچێتە کن کوڕەکان، پێیان دەرێ ئەو شەڕە کو بوو دەرێن کوڕەك هەبوو ئەگەر بهاتایە ئەوە برامان بووایە دونیا هیمە دەبوو جەمیل دەرێ ئەوە ئامۆزاتانە، لەوێ بەیەکتریان شاد دەکات و ئەوجا هەر چاریان هێرش لۆ سەعیدی دەبەن و ئەوەی دیل دەبی لێی دەگەڕێن ئەوی دیکە دەکوژن و سەعیدیش دەکوژرێ و لە پاشان کوڕەی شێخ محەمەد دەکەنە ئاغای گوندەکە و ئەمنیش کراشم دڕا و چم پێ نەبڕا.

-----------------------------------

* ئەم هەقایەتە لە زاری بەڕێز(محەمەد خدر)م گوێ لێبووە وەکو خۆی تۆمارم کردووە.

* لە گۆڤاری ئاسۆی فۆلکلۆر بەناوی ئەحمەد چاوڕەش بلاّوم کردۆتەوە.

## دوو خوشك

هەبوو نەبوو، کەس لە خودای گەورەتر نەبوو، کەس لەدرۆزن ڕووڕەش تر نەبوو ، دوو خوشك هەبوون هەردووکیان مێردیان کردبوو خوشکی گەورە مێردەکەی ئاغایەکی هەر چەند برێی دەورەمەند بوو، خوشکی گچکەش مێردەکەی هەر چەند برێی فەقیر و نەداربوو خوشکی گەورە لەبەر ئەوەی پیاوەکەی دەورەمەندو کوڕە ئاغا بوو گەلەك هەوا و نەفسی پەیدا کردبوو، هەر نەدەچووە کن خوشکەکەی و قەت سەردانی نەدەکرد و هەر بە خوشکی خۆشی نەدەزانی و داینەدەنا، بەران خوشکی گەورە منداری نەدەبوو، خوشکی گچکەش شەش سار لەسەر یەکتری کوڕی دەبوو لەساری حەفتەمنیش زگی هەبوو، خوشکی گەورە زۆر لەخۆی دەترسا پیاوەکەی ژنی بەسەر بێنی لۆییێ چووە لای خوشکی گچکەیی و پێی گۆت خوشکم ئەتوو هەموو سارێ مندارەکت دەبێ، ئەمنیش هیچ مندارم نییە گەروا بڕوا مێردەکەم ژنم بەسەر دەینی ژینیشم بەسەر بینی ژیانم تار دەبێ،خۆشیم نامێنێ، خوشکی گچکە گوتی:خوشکم من زگم هەیە، پاش ئەوەی کەوتمە مانگی خۆم، بەمێردەکەت برێ زگم هەیەو لەکن خوشکم دەبم هەتا مندارەکەم دەبێ، خوشکی گەورە چووە مارەوەو گۆتیە مێردەکەی پیاوەکە زگم هەیە بەران مانگێکم بمێنێ دەچمە کن خوشکم لەوێ لۆمن باشترە مێردەکەی بەو قسەیە گەلەك دری خۆش بوو گۆتی:زۆر باشە، ماوەیەکی پێچوو، مانگێك ما، خوشکی گچکە منداری ببێ، خوشکی گەورە چووەکنی، مێردەکەشی ماوە ماوە سەری لێ دەداو کەل و پەل و خواردنی باشی لۆ دەبردن هەتا



مانگەکە تەواو بوو، خوشکی گچکە منداری بوو، کوڕ بوو خوشکی گەورە گەلەك درخۆش بوو، گۆتی بەخوشکی گچکەی مندارەکەم پێ بدە بابڕۆم، خوشکی گچکە گوتی:منداری چی ناتدەمێ لۆ هەتا ئەرحان ئەمنت نەدەناسی، ئەمنت هەر بەخوشکی خۆت نەدەزانی و لە کنت شەرم بوو قسەشم لەگەر بکەی و برێی ئەوە خوشکمە، بەدرۆ پێم گۆتی مندارەکەت دەدەمێ، خوشکی گەورە زۆر درتەنگ بوو، لەپێشوو پەشیمان بۆوە بەران تازە لەدەستی چوو بوو،لەو لاشەوە مێردی خوشکە گەورەکەش زانی مانگەکە تەواو بووە دوو ماینی جوان دەرازێنێتەوە دێ لۆ کن ژنەکەی لۆ ئەوەی مندارەکەو ژنەکەی بباتەوە، خوشکی گەورە لە شەرمان بەردەکی لەناو پارچە پەڕۆیەك لول دەدات هەرکە مێردەکەی گەیشتە کنی و یەکسەر گۆتی: توخوا مندارت بوو چ بوو، کوڕ، یاکیژ، ژنەکە، ژنەکە گوتی، کوڕم بووە، ئەویش گوتی: با تەماشایەکی بکەم، ژنەکە پێی گۆت خەوی لێ کەتییە، هەریەکە و سواری ماینەك بوون و بەرەو مار گەڕانەوە لەرێگا تووشی شینایییەك دەبن، ژنە دەرێ دەچمە لای ئەو شینایییە هەندەك ئاوی دەخۆمەوە، لادەداتە لای شینایییەکە و دەبینی مندارێکی گچکە لەو گۆڕە دایان ناوە لە دوورەوەش ژنێك و پیاوەکی جاعێر پێ دەکەنن گەمە دەکەن ئەویش هەندەك ئاوی دەخوا و مندارەکەی هەردەگری و بەردەکەی لەجێیەکەی دادەنێ، بەران مندارەکە زۆر پێی خۆش دەبی، ژنە لە خۆشیان شاگەشکە ببوو دەوی لۆیەك نەدەهاتەوە سواری ماینەکە بۆوە و دیسان مێردەکەی دەرێ، دەبینە تەماشایەکی مندارەکەی بکەم. ئەویش پێی نیشان دەداو کابرا تەماشای دەکاو دەبینی کوڕەکی گەرەك جوانە هەندی تر درخۆش دەبێ، مندارەکەی دەینەوەو لەپاش ئەو مندارە دووسار لەسەر یەکتری کوڕی دەبێ واتە دەبیتە سێ کوڕ بەران گەورەکەیان لەوانی تر خۆشتر دەوێ، لەو لاشەوە داك و بابەی خاوەن کوڕ کاتێ دێنەوە لای دەبینین کوڕەکەیان نەمایە، بەردێك لەجێگای دانرایە، لەعەژمەتان زۆر خەم دەخۆن و شەوو ڕۆژ دەگرییێن هەتا هەردوو چاویان کۆرە دەبێ، ئەوە لەلایەك،لەلایەکەی دیکە ڕۆژەك پیاو چاکێك یا برێین پیاوەکی ئاقر بەلای ماری ئاغا

تێدەپەڕێ دەبینی دوو مندار بەیەکەوە گەمە دەکەن و مندارەکی دیکە لە ئەوان گەورەتر ئەویش دارێکی لە شکلی هەوجار دروست کردووەو گەمەی پێ دەکا، کابرا دەچیتە لای کوڕە دەرێ ئەوە چ دەکەی کوڕە، دەرێ ئەو چلکە دارانەم کردیتە هەوجار خۆم فێری چۆت کردن ببم لۆ ئەوەی کاتێ گەورە بم عەرد بکێڵم، ئەو مندارە هەردەم بەتەنێ گەمەی دەکرد لەگەر منداران تێکەر نەدەبوو، زۆر فکری لەئیش کردن دەکردەوە، دوو کوڕەکەی دیکەش بەیەکەوە گەمەیان دەکرد، کابرای ئاقر کە گێی لەو قسانە بوو لەیەکەکی پرسی ئەرێ ئەو مندارانە ئی کێنە، ئەویش گۆتی: منداری ئاغای ئەو گوندەنە، کابرا چووە ماری ئاغای بە ئاغای گۆت: ئەو مندارانە ئینگۆنە، ئاغا گۆتی:بەرێ، کابرا گۆتی: ئاغا کوڕی گەورە، کوڕی تۆنییە، ئاغا زۆر توڕە بوو، بەتۆرەیی گۆتی: کوو ئەو قسەیەی دەکەی، کابرا گۆتی: برۆ لە ژنەکەت پرسیار بکە بزانە دەرێ چی ، ئاغا گاسی ژنەکەی کردو گۆتی: ئەو کابرایە دەرێ کوڕی گەورە ئینگۆ نییە راستە یان نا، ژنەکە گۆتی: ڕاست دەکا، بەسەرهاتی کوڕەی لۆ گێڕاوە، کابرا گۆتی: داك و بابی ئەو کوڕەی ماینە بەران هەردوو چاویان کۆرە بووە لە عەژمەت ئەو کوڕەی ماریان لەفلان جێیە، کە ئەو کوڕە جاعێر بوو، ژنەکی جوانی لێ مارەبکەن و بە ئاهەنگ گێران بیبەنەوە، کوڕە دەستە سرەکەی بە چاوییان دابینی چاوییان چاك دەبیتەوە، ئاغا گۆتی: زۆر باشە، کابرا رۆیی، چەند سارەکی پێچوو، کوڕە جاعێر بوو، ژنێکی جوانیان لێ مارەکردو بەئاهەنگ گێران چوونە ماری داك و بابەی کوڕە، خەرکی گوندەکە سەریان لێسورما، کوو ئاغە بە ئاهەنگ گێران لۆ ئەو مارە هاتیە کە چوونە ماری داك و بابەی کوڕە و کوڕە دەستەسرەکی بە چاوی داك و بابی داهێنا چاوییان چاك بۆوە، ئاغا کوڕەکەی بە داك و بابەی ناساندەوەو بەسەرهاتەکەی لۆ گێرانەوە، داك و باب و کوڕە بەیەك شادبوون و داکە و بابە گەرەك مەمنوونی ئاغا بوون ئاهەنگ حەفت رۆژ و حەفت شەو بەردەوام بوو، ئەوجا لەپاشان ئاغە و ئاغاژن پاش چەند رۆژەکی دیکە لەوێ مانەوە ئەوجا گەڕانەوە مارێ و کوڕە



لەوێ بەجێما وەخت بوو شێت بێ ناچار ئاغا ماری خۆی بارکرد لۆ گوندی ماری بابی کوڕەی ئەمنیش هاتمەوە چیم پێنەبڕا .

------------------------------------

**تێبینی:** ئەم چیرۆکە فۆلکلۆرییە، لە زاری محەمەد خدر گوێ بیست بوویمە، ئەویش داپیرەی بۆی گێڕاوەتەوە.

## حەسەن راوچی

هەبوو نەبوو کابرایەك ناوی حەسەن بوو ئەو کابرایە کار و پیشەی راوکردن بوو، به حەسەن راوچی بەناوبانگ بوو هەتا نەتگۆتبایە حەسەن راوچی نەدەناسرا، دوو ژنی هەبوو لە هەردوو ژنەکان هیچ منداری نەبوو رۆژەك لە رۆژان لە راویٚ دەگەڕا لە دوو نێچیرێك تەیرێك، کێروشکەك، مامزێ چەندی گەڕا و سوڕا ئەو رۆژە هیچی بەرچاو نەکەوت، رۆژ درەنگ بوو گەڕایەوە لۆ ماریٚ لە رێگا تووشی دوو ماران بوو مارەکان لێك ئارابوون یەکێکیان زۆر، زۆر جوان بوو یەکەکیان مارەکی پیس و بۆر و ناشیرین بوو، گۆتی وەڵڵاهی وا باشە ئەو مارە پیسە بکوژم لەو مارە جوانە ئارایە، تفەنگەکەی لە مل هینا خوارەوە و گوللەکی لە مارە پیسەکەی گرت پێی نەکەت چوو بە مارە جوانەکە کەت مارە جوانەکەی کوشت، مارە پیسەکەش هەندە بۆر و پیس بوو خۆی بزرکرد، گەرا و سوڕا لە مارە پیسەکە مارەکەی نەدیتەوە، بە در عاجزی رۆیی لۆ ماریٚ دانیشت لە ماریٚ زۆر عاجز بوو، ژنەکان پێیان گۆت ها لۆ وا عاجزی قەت ئەتوو ئەوەندە عاجز نەبووی ئەویش بەسەرەخۆی نەهینا هیچ دەنگی نەکرد، ئەو مارە جوانەی کە حەسەن راوچی کوشتی ژنی شای ماران بوو، ئێوارە شای ماران تەماشای کرد ژنەکەی نەهاتەوە چەند مارێکی لەلا بوو لە مارەکانی پرسی گۆتی: ژنی منتان نەدیتیە ئەمرۆ، گۆتیان نەخێر پاشا نەماندیتیە. پێی گۆتن دەبڕۆن سوئال کەن بگەڕێن هەتاکو جوابەکی راستم لۆ دەیننەوە، مارەکان هاتن گەڕان و سوڕان گەیشتنە هەر مارەکی سوئالیان لیٚ کرد دەیانگۆت نەمان دیتیە، ئەوجارە



گەڕان تووشی مارەکی بوون سوئالیان لیٚ کرد ژنی پاشات نەدیتیە گۆتی: بەریٚ ژنی پاشام دیتیە لە فرانە جێگا کوژرا، گۆتیان فەرموو لەگەرمان لۆ کن شاهی ماران، بەگەریان کەت هاتن گەیشتنە شای ماران، گۆتیان پاشا ئەم مارە جوابی ژنەکەی تووی لەکنە، شای ماران گۆتی: وەرە راستم پیٚ بریٚ ئەتوو ئەو ژنەی منت دیتیە، گۆتی: بەریٚ شا گۆتی: چی لیٚ هات، گۆتی: کوژرا، شا گۆتی: لۆ کوژرا، گۆتی: کابرایەك ناوی حەسەن راوچییە، لەو گوندەی دادەنیشی لە راویٚ دەگەڕا تووشی ژنەکەی توو بوو لەگەر مارەکی زۆر پیس و بۆر و ناشیرین بوو ویستی مارە پیسەکەی بکوژی، کە گوللەی هاویشتیٚ بە ژنەکەی توو کەت مرد، مارە پیسەکەش خۆی بزر کرد هەرچەندی لە دوای گەڕا نەیدیتەوە زۆر زۆر بە عاجزی گەڕایەوە گوندەکەی خۆی، شای ماران گۆتی: ئەتو کابرای دەناسی، مارەکە گۆتی: بەریٚ دەیناسم زۆر چاکی دەناسم هەتا مارەوەش لەگەری چوویمە دەزانم ماریشی لەکێیە، شای ماران گۆتی: دە باشە، ئەو شەو دەچیە مارەکەیان پێی دەرێی وەرە ئەو جێگایەی مارە جوانەکەت لیٚ کوشت، شای ماران ئیشی پێتە، مارەکە گۆتی: باشە، مارەکە هات لۆ گوندی رۆیشتە لای ماری حەسەن راوچی، گۆتی: با کەس نەمبینی با نەمکوژن وا چاکە بچمە ناو پێراوەکانی کە پێراوی لەبەر دەکا و ئەو کاتە پێی دەرێم، خۆی هاوێشتە ناو پێراوەکانی حەسەن راوچی وەختەك حەسەن هەستا هاتە دەریٚ پێراوەکانی لەبەرکرد پێی خستە ناو پێراوەکەی هەستی کرد شتەکی زۆر نەرمی تێدابوو پێی نەچووە ناو پێراوەکەی، پێراوەکەی راوەشاند دیتی مارەك لەناو پێراوەکەی کەتە خوارەوە چاك و چۆنی لەگەر حەسەنی کرد، گۆتی: حەسەن مەمکوژە من هاتوومە چەند سوئالێکت لیٚ دەکەم، حەسەن گۆتی: باشە فەرموو با بچینە دەریٚ، هاتنە دەریٚ مارەکە گۆتی: کاك حەسەن وەختی ئەو مارەت کوشت لۆ کوشتت؟ حەسەن راوچی گۆتی: ئەتوو کو دەزانی ئەمن ئەو مارەم کوشتیە، مارەکە گۆتی: ئەمن هەندەك لەنگۆ دوور بووم وەختی مارەکەت کوشت، حەسەن راوچی حیکایەتی بە تەواوی لۆ گێڕاوە، مارەکە گۆتی: باشە کاك حەسەن ئەتوو ئەو مارەی لەگەر مارە جوانەکە تێك ئارابوو

دەناسیەوە، حەسەن گۆتی: وەڵڵاهی برێم چی نازانم سەت مار پێك دەچی، ناوەڵڵا ناینا‌سمەوە، مارەکە گۆتی، کاك حەسەن من مارەکە دەناسم وەرە با پێت برێم بەیانی لەکێندەرێ مارەکەت کوشت دەچیە ئەوێندەرێ شاری ماران دێ ئەو مارەی کوشتت ژنی شای مارانە من لەکن شای ماران خۆم لە عاردی مات دەکەم شای ماران گاسی هەموو مارەکی دەکات هەرچەندە مار هەیە خڕدەبیتەوە رادەوەستن هەر مارەکی هات سوئالت لێ دەکا پێت دەرێ ئەوە هەوە یان نا، تەماشاکە حەسەن کەینێ من سەرم لە عاردی برند کرد ئەو مارەیە، برێ پاشای بەڕێز ئەو مارەیە، دوایی پاشا چەند پرسیارێکت لێ دەکا وەڵامی دەوێ بخوازە هەتاکو لۆت بکەم پێی برێ پاشام خۆشبی هیچم لێت ناوێ بەس تفی سەر زاری توو نەبی، وە دەتداتێ رازیش دەبی دوایی هەندەك قسەت لەگەر دەکات و ئەتووش جوابی قسەکانی بدەوە، دەرێ سبیانێ حەسەن راوچی هەستا نانی خوارد و خۆی لەبەرکرد دەستی دا تفەنگەکەیی و هات لۆ جێگای مارەکەی لێ کوشت بوو گەیشتە جێگایەکەی تەماشای کرد مارەك راکشایە ماری ئەوهای بە حەیاتی خۆی نەدیبوو هەندەی یەك کەژی کوردەواری خۆمان پان و درێژە سەلامی لێکرد سەلامەکەی لێ وەرگرتەوە بەخێرهاتنی کرد پێی گۆت ئەتوو حەسەن راوچیی گۆتی: بەرێ، گۆتی: باشە سوئالێکت لێ دەکەم راست وەڵامم بدەوە، حەسەن گۆتی: فەرموو پاشای ماران گۆتی: ئەو مارەت لۆ کوشت و ئەو مارەی لەگەر ئەو مارەیکوشتت دەیناسیەوە؟، حەسەن راوچی تەماشای کرد ئەو مارەی کە شەو هاتبووە لای حەسەن هات لە تەنیشت شای ماران راوەستاوە حەسەن زۆر کەیفی خۆش بوو گۆتی: وەڵڵاهی پاشا ئەو مارەی لەگەر ئەو مارەی تێك ئارابوون مارەکی زۆر، زۆر پیس و بۆر و ناشیرین بوو ئەو مارەی کە کوشتم زۆر، زۆر جوان بوو گۆتم: وەڵڵاهی دەبی ئەو مارە پیسە بکوژم ئەوا لۆ لەگەر ئەو مارە تێك ئاراوە تفەنگەکم هاوێشت بە مارە جوانەکەی کەت و کوشتم، زۆر، زۆر لە دوای مارە پیسەکە گەڕام نەمدیتەوە بیکوژم زۆر، زۆر عاجز بووم وەخت نەمابوو گەڕامەوە مارێ بە عاجزی و ئەو مارە پیسەی لەگەری بوو دەیناسمەوە، گۆتی: باشە ئێستا من گاسی هەموو



مارەکان دەکەم بێنە ئێرە ئەتووش برێ وەڵڵاهی ئەو مارە بوو حەسەن گۆتی. بەرێ باشە، شای ماران گاسی کرد مار بە کۆمەر دەهاتن ئەوانە هەون دەیگۆ نەخێر، ئەوجارە گاسی کرد مار هاتن ئەوانە هەون دەمگۆ نەخێر ئەوجارە گاسی مارەکانی کرد کەم کەم هاتن گۆتی: ئەوانە هەون گۆتی: نەخێر چونکە ئەو مارە کە قاسید بوو سەری لە عەردی برند نەکرد ئەوجارە گاسی مارەکانی دیکەی کرد هاتن مارەك گۆتی: وەڵڵاهی پاشا مارەك زۆر پیرە ناتوانی بێ وا لە فلان جێگایە، شای ماران گاسی دوو گەورەی کرد گۆتی: برۆ لەسەر پشتی خۆتان قایمی کەنوو بهینن، مارەکان رۆیشتن چوون مارەکەیان هینا، مارەکەی کن شای ماران سەری راست کردەوە ملی قیت کردەوە، حەسەن گۆتی: بەرێ پاشا ئەم مارە بوو لەگەر مارە جوانەکە تێك ئارابوون، شای ماران گۆتی: حەسەن ئەم مارەم لۆ بکوژە، حەسەن راوچی تفەنگەکی لە مارەکەیدا و کوشتی، شای ماران گۆتی: حەسەن بخوازە ماری دنیاییێ چیت دەوێ، هەتا بتدەمێ، حەسەن گۆتی: وەڵڵاهی هیچم ناوێ تفی سەر زاری تووم دەوێ، شای ماران گۆتی: وەڵڵاهی هەموو شتەکت داوا بکردایە دەمداییێ بەس تفی سەر زمانی من زۆر گرانە کاکە، دواتر شای ماران گۆتی: کاك حەسەن من تفی خۆمت دەدەمێ بەڵام زۆر، زۆر گرانە لەکن هەر شتەکی روحی لەبەربی باس بکەی دەمری، حەسەن راوچی گۆتی: بەشەرت لەکن هیچ روح لەبەرێك باس ناکەم قەت هەتا ئەمن مایمە، شای ماران تفەکی خۆی لەسەر زمانی حەسەنی دا، گۆتی: برۆ حەسەن، حەسەن دوعابوونی خۆی خواست گەڕایەوە هەستی راگرت تەیر لە عاسمانێ دەزانی چی دەرێ هەرچیەکی بوێ، حەسەن راوچی لەخۆشیان نەگەیشتەوە مارێ، دیارە ئەو وەختی بوار بووە تەماشای کرد رەشمارەکی گەورە دیارە گۆتی: وەڵڵاهی وا چاکە ئەو شەوە بچمە ئەو رەشمارەی بەیانی بگەڕێمەوە مارێ، هات رۆیی گەیشتە رەشمارەکە و سەلامی کرد چووە ژۆرێ دانیشتن بە ئەمری خوای گەورە دەستی بە بارانێ کرد مەڕ و حەیوانی رەشمارەکە هەموو هاتەوە لۆیە مەغریب نانیان هینا دەستیان بەنان خواردن کرد، حەسن هەستی راگرت سەگەران دەستیان بە لوورە لوور کرد هاتە دەرێ تەماشای کرد

سەیەکی سپی دەیگۆ وەڵڵاهی هەرچەندی گورگ لە مەنتقەی هەیە بێت نایەڵم دەوتان بە گۆشتی بکەوی بەس خواردنی مێوانەکەم لەپێش بووایە کە حەسەن گێی لیٚ بوو هەستا شیوەکەی لەپێش بوو بە نانەوە بردی لە پێش سەیەکەی رووکرد ساحێب مارەکە گاسی ژنەکەی کرد گۆتی: وەرە بزانم ئەو شیوە چی تێدابوو، ژنەکە هەزار سوندی لۆ خوارد دەیگۆ وەڵڵاهی هیچی تێدا نەبووە، حەسەن هاتەوە ژۆریٚ دانیشت ساحێب مارەکە گۆتی: کاکی مێوان لۆ ئەم شیوەت لە پێش سەیەکە رووکرد چی تێدابوو، حەسەن گۆتی: نەخێر هیچی تێدانەبوو بەس هەر ئەوها کەیفم لیٚ بوو، (بە بیری هاتەوە نابی باس بکات بریٚ من لە زمانی سەی دەزانم) دانیشت شەو راکشا جێگایان چاکرد لۆ خۆیان بنوون، هەندەکیان نووستن دوایی هەموویان نووستن کاتەك شوانەکان بەخەبەرهاتن مەڕ و حەیوان لە رەشماریٚ نەمایە هاواریان کرد ساحێب رەشمارەکە و حەسەن راوچی هاتنە دەریٚ دەبینن یەك مەڕ نەمایە بارانە، تاریکەشەوە چاو چاوی نابینی حەسەن گۆتی: کاکە هیچ خەمی مەخۆن وەرن با بزانین سەیە سپیەکە لەگەریان چووە یان نا؟ گەڕان تەماشایان کرد سەیەکان هەموویان لەبن رەشمارەکە نووستینە بەس سەیە سپیەکە لەگەر مەڕی چووە، حەسەن راوچی گۆتی: کاکە مادام سەیە سپیەکە لەگەر مەڕی چووە ئەگەر مەڕەکتان خورا دە مەڕت لۆ دەکڕم کاوڕەکتان خورا دە کاوڕتان لۆ بکڕم ساحێب مارەکە گۆتی: باشە کاك حەسەن ئەدی ئەگەر هیچمان نەخورابوو ئەمە چیت لۆ بکڕین، حەسەن وەڵامی داوە، گۆتی: من بە کەیفی خۆم مەڕەك لەناو مەڕەکان هەردەبژێرم، ساحێب مارەکە گۆتی: بەس یەك مەڕ، حەسەن گۆتی: بەریٚ یەك مەڕم بەسە، هەموویان هەستان رۆیشتن بە دوای مەڕی گەڕان و سووڕان مەڕەکەیان دیتەوە، سەیە سپیەکە لەسەر بەردەکی هەرقونجایە دەلوری یاخوا حەسەن بەخێربیٚ، مەڕەکەیان دا پێشەخۆ مەڕەکەیان هیناوە ماریٚ، سبیانیٚ سەرژمێریان کرد حسابی مەڕی تەواوە، ساحێب رەشمارەکە گۆتی: کاك حەسەن ئەگەر مەڕەکەی خۆت نیشان دەکەی، حەسەن گۆتی: باشە، حەسەن هاتە ناو مەڕەکەی مەڕەکیان گۆتی: حەسەن نیشانمکە بە شەرت ساریٚ دوو بەرخت لۆ بینم



یەکی دیکە دەیگۆ حەسەن نیشانمکە من سیٚ بەرخت لۆ دەینم حەسەن گەڕا مەڕەکی خراپی چرمنی پیسی دیتەوە گۆتی: کاکە ئەو مەڕە ماری منە مەڕەکە کەڕەبوو ئەوجا مەڕی کەڕە زۆر بەنرخە لۆ راگرتن ساحێب مەڕەکە گۆتی: وەڵڵاهی ئەوە شێتە بزانە لەناو ئەو هەموو مەڕە چاکەی ئەو مەڕە پیسە خراپەی نیشان کرد، ئەوجا حەسەن گۆتی: کاکە ئەمن دەڕۆم ناونیشانی خۆتم بدیٚ ئەگەر هاتمەوە دوو مەڕەکەی ساحێب مار گۆتی: بە سەرچاوان ئەوە نا و نیشانمە حەسەن لییێدا رۆیی گەڕاوە ماریٚ ژنەکانی گۆتیان حەسەن ئەوە چەند رۆژە ئەتوو لەکیٚ بووی ئەمە هیچ خەبەری توومان نەزانی و زۆر خەممان لۆ خواردی، حەسەن گۆتی: وەڵڵاهی تووشی چەند برادەرێکی زۆر، زۆر خۆشەویست بووم ئیتر نەیانهێشت بێمەوە لەلایان مامەوە، گۆتیان دەباشە بەخێربێیەوە، سبیانی حەسەن دەستی دایە تفەنگی خۆی لێیدا چووە راویٚ گەڕا و سوڕا لە ئاقاری تووشی دوو مامزان هات یەکێکی کوشت چووە سەری خەنجەری دەرهینا سەری مامزەکەی بڕی مامزەکەی لەسەر شانی خۆی دانا هاتەوە ماریٚ، ئێواریٚ دەستیان کرد بە گۆشت خواردنی مامز پاشان چەند سارەکی پێچوو رۆژەك حەسەن گۆتی: باشە لۆ نەچم تاقیبی ئەو مەڕەی خۆم بکەم بزانم چی لێهات، دەریٚ حەسەن دەزانی ئەوانە لەکێندەرێنە، هات رۆیی گەیشتە رەشمارەکان سەلامی لێکردن دەست و دەوی یەکدیان ماچ کرد دانیشتن زۆر، زۆر بەخێرهاتنی حەسەنیان کرد ئێواریٚ کە نانیان خوارد حەسەن گۆتی: خزمینە دەزانی من لۆ چی هاتیمەوە گۆتیان فەرموو کاك حەسەن، گۆتی: لە دوای مەڕی کەڕە هاتیمە، گۆتیان ها، هو مەڕی کەڕە ئەوە چەند سارە مردیە و هەر ناویشی نەماوە، حەسەن گۆتی: قەیناکە مەڕی کەڕە مردیە ئەدی نەوەکەی بێچووەکانی، گۆتیان هیچ نییە دوو یان سیٚ بەرخی هینا و مرد، حەسەن گۆتی: کاکە ئێستا هەندەی ناهینی بەیانی زوو کە هەستاین نانمان خوارد با مەڕ نەڕوا دەچینە کن مەڕەکان گاسیان دەکەم مەڕی لە مەڕەکەڕیٚ ئەوی هاتە کنە من ئەوا مەڕی منە و نەهات ئەوە مەڕینگۆیە، گۆتیان رازین، ساحێب مارەکە گۆتیانە شوانەکان بەیانی هەندەك خێو سورایەتی لەگەر خۆتان هەرگرن دەمی

مەڕەکان سورکەن بە خێ هەتا نەچنە دوو حەسەن، گۆتیان باشە بەیانی هەستان نانیان خوارد و چوونە کن مەڕەکان، گۆتیان حەسەنی گاسکە گاسی کرد وەرنە دووم مەڕی لە مەڕەکەڕێ مەڕەکان دەستیان بەجوولە جوول کرد تێك سووڕان هەموویان هاتنە کن حەسەن خڕبوونەوە چەند پیرە مەڕێکی خراپ مانەوە لە کن شوانەکە، بەرانێکی زۆر، زۆر گەورە لەناو مەڕەکەی حەسەن هاتە کن شوانەکە و لەکن شوانەکە دەگەڕاوە کن حەسەن شوانەکە هات گۆتی: کاك حەسەن مادام دەزانی ئەمانە هەمووی مەڕی توونە وەرە مەسەلەی ئەم بەرانە چیيە حەسەنیش گۆتی: کاکە ئەوە بەرخی نگۆ بووە بە مەڕی من مژرایە شوانەکە گۆتی: وەڵڵاهی ڕاست دەکەی ئەم بەرانە داکی مرد بە مەڕی توومان مژاندیە حەسەن گەڕاوە بەخۆو بە مێگەلە مەڕەکی هاتەوە گوندی ئەو هەموو مەڕە جوانە گۆتیە ژنەکان وەرن ئەم مەڕانە بدۆشن دەستیان کرد بە مەڕ دۆشین، دەرێ حەسەن وازی لە ڕاو و شکاری هینا و لۆ خۆی کەتە دوای مەڕی خۆی بوو بە ساحێب مەڕ و مەڕدرای ئەمنیش گەڕامەوە بەپێی پەتی بە قات و قوڕی کراشەم دڕا و چم پێ نەبڕا.

-------------------------------------

* گێڕانەوەی ئەم هەقایەتەم لەسەر زاری مەحموود خدر تۆمار کردووە لەدایکبووی ١٩٥٠ دانیشتووی شاری هەولێرە.
* لە گۆڤاری ئاسۆی فۆلکلۆر ژمارە ٢٤ ساڵی ٢٠٠٧ بلاوکراوەتەوە.

# ژنیش هەیە و ژانیش هەیە

هەبوو نەبوو کەس لە خوا گەورەتر نەبوو، کابرایەکی خواپێداو هەبوو، ئەوکابرایە تەیرو تواری خڕ کردەوە، گۆتی: کێ دەتوانێ بچی ئەوسەری دنیام لۆ سەح بکاتەوە،؟؟ تەیروتوار هەموو لە بەینی خۆیان تەگبیرەکیان کرد گۆتیان لە تووتی ئازیزترمان تێدا نییە،؟؟ سبەینێ هەستا تووتی ڕۆیی، ئەگەر ڕۆژەك ئەگەر دوو ڕۆژ ڕۆیی، تووشی دەریا و ئاو و دەشت بوو، تووتیش عادەتی وایە لەجێی سارد نانیشی،؟؟ گەیشتە دەوری بەحرەکە بنەدارەکی دیت ئەوشەوە چوو لەسەر بنەدارەکە هەڵنیشت، سبەینێ هەستا و ڕۆیی هەتا ئێوارێ، ئێوارە قەراییەکی دیتەوە لەناو دەریاکە لەسەری هەڵنیشت، وەختێك ماسییەك لێی بەقسە هات و گۆتی تووتی ئەوە کێوە دەچی؟ تووتی گۆتی: مادام دەزانی من تووتیم دەبێ بشزانی من کێوە دەچم، ماسیەکە گۆتی: تووتی دەتەوێ ئەوسەری دونیایێ سەح بکەیەوە، ئەوە تۆ ڕۆژەکە لەسەر پشتی منەوە دەڕۆیی ئەوجا وەرە پیاوی چابە لۆخۆت ڕێ و ڕاست بگەڕێوە، من ماسیەکم لەو دەریایە لەترسی ماسی دی خۆم هاوێشتیتە ئەو لێوارە، تووتی ڕێ و ڕاست گەڕاوە، هاتەوە سەر دارەکەو وەختەکەی ئێوارەبوو، دارەکە لە لێو دەریاکەبو، چووە سەردارەکە، قەلێکی لەسەربوو قەلە دەستی بە قیڕەقیڕ کرد و گۆتی تووتی ناهێڵم بێیە سەر ئەو دارە ئێرە جێی منە و بەیەك شەرت دێڵم ئەگەر مارەم بکەی، تووتیش عادەتی وابوو ئەگەر لەسەر دار نەبایە نەدەخەوت، هەرستا پێی گۆت: بەڵێن بێ مارەت دەکەم، قەلە تووتی خستە بن باری خۆی تا بەیانی هەرستان لە خەو، قەل پێی



گۆت تووتی وەرە  مارەم کە، ئەویش گۆتی ئاوها نابێ دەبێ بچیتە لای مەلا لەوێ مارەتکەم، هەرستان قەلە و تووتی بڕۆن تووتی لێی دا و فڕی و ڕۆیی قەلەی بەجێ هێشت، ئاخر تووتی و قەلە نابنە یەك تووتی لە فڕین ئازاترە، تووتی ڕۆیی و گەیشتەوە دیوانی کابرای خواپێداو، فەرمووی سەحت کردەوە، ئەویش گۆتی: نەء، حەفتەکی پێ چوو قەلەك هاتە دیوان، لەلای کابرای خواپێداو، شکاتی لە تووتی کرد، گاسی تووتیان کرد، گۆتیان وەرە بزانە ئەو قەلە لەبەرچ شکایەتت لێ دەکا، قەلەکە گۆتی: بەرێ، لەبەرئەوە شکایەتی لێ دەکەم قەول بوو مارەم بکات، هەنووکەش هەراتیە و مارەی نەکردومە، گۆتیانە تووتی وەرە مارەی بکە، تووتی گۆتی من ژن ناهێنم، گۆتیان دەبی سەبەبەك هەبێ تۆ لەبەر چ ژن نایینی، تووتی گۆتی: باشە من هەقایەتەکتان لۆ دەرێم، تووتی گۆتی: پاشایەك هەبوو یەك تاقە کوڕی هەبوو کوڕەکەی جاحێل بوو ، گۆتی من ژن لۆ کوڕەکەم دەهێنم، خۆی داخوازی لۆ کرد، هەرستان شایی و هەرا و هۆریایان لۆ کوڕەکە کرد و ژنیان لۆ کوڕە گواستەوە، پاشا گۆتی: دەبێ قەسرێك لۆ کوڕەکەم دروست بکەم بەرامبەر دیوەخان، لەبەرئەوەی ئەگەر لەدیوەخان دانیشم ماری کوڕەکەم لێ دیاربی، خانویەکیان دروست کرد، ماری کوڕەکەیان هینایە ناو، ڕۆژەك فەقیرەك دەگەڕا سەری بە ماری کوڕی پاشا داگرت، ، گورج گەڕاوە، پاشا و کوڕەکە لە دیوەخان چاویان لێ بوو، کوڕە بە بابی گۆت: باوە ئەو فەقیرە بێ سەبەب نەبوو سەری بە مارێ داگرت و گورج گەڕاوە و هیچی وەرنەگرت، من وا بەدوای دادەچم، فەقیر نەچووە هیچ مارێکی دی ڕاست ڕۆیی لە گوند دەرچوو و چووە سەر کانی لەوێ دانیشت، دارێکی پێ بوو وەکو سەیوان، دارەکەی لێك کردەوە سیحرێکی لەسەرخوێند و ئافرەتێکی دروست کرد لەخۆوە، گەمەی لەگەر کرد، کوڕە پاشاش وا تەماشای دەکا، ئەوجا کابرای فەقیر سیحری خوێند و ژنە بزربوو نەما، دارەکەی لێك داوەو، کوڕی پاشا چووە لای پێی گۆت: خارە دەروێش دەبێ ئەو شەو مێوانی من بی و، چوونە ماری کوڕی پاشا شەو لەوێ بو، کوڕە پاشا بەژنەکەی گۆت نانی چار نەفەرم لۆ دروست بکە، دەروێش گێی لەو قسەیە

بوو گۆتی نەء نانی پێنج نەفەرم لۆ دروست بکە، ئەوجا کە نان دروست کرا، نانیان هێنا دایاننا ئەوان سێ نەفەربوون پێنج نەفەر خواردن دانرا، کوڕی پاشا دەستی دا شیر، هەری کوتا سەر دەروێش گۆتی: ئەگەر نەفەرێك نەهێنی لەسەر ئەوقاپە نەخوا بەو شیرە شەقت دەکەم، ئەوجا دەروێش ناچار بوو دارحەساکەی لێك کردەوە دەستی بەسیحر خوێندنەوە کرد ئافرەتەکی دروست کرد، ئەویش لەسەر قاپەك دانیشت، ئەوجا دەروێش گۆتیە کوڕی پاشا من ئیزنم لەلای تو، هەرستا دەستی دایە شیرەکە گۆتیە خێزانی کوڕی پاشا ئەگەر تۆش نەفەرێك نەهێنی لۆ سەر ئەو قاپە بەو شیرە شەقت دەکەم، ناچار بوو ژنە هەرستا دەرگەی سندوقی کردەوە زەلامێکی دەرکرد هینایە سەرقاپەکە دانیشت، نانیان خوارد، دەروێش و کوڕی پاشا دەرکەیان پێوەدا هەرسێکیان کوشت ئەوجا تووتی گۆتی: ئەی پیاو خواپێداو من لەبەر ئەوەی ژن ناهێنم، ئەوجا قەلە گۆتی: ئەی خواپێداو رووخسەت هەیە هەقایەتەك برێم گۆتیان فەرموو، قەلە گۆتی: پاشایەك هەبوو ئەوکاتی کوڕەکی هەبوو ژنی لۆ کوڕەی نەهێنابوو ئەوکاتیش ژن بە خواستن و داخوازی نەبوو دەچوون کۆمەرێك ژنیان دەهێنا ناوییان نابوون (جاری) هەریەکەی دەچوو یەکی لۆخۆی هەردەبژارد، کوڕی پاشایەك، یەکێکی لەو جاریانەی هەربژارد لۆخۆی، ئەو جاریە، بە کوڕی پاشای گۆت: من دەستی سنحاتم هەیە، هەردەستا قوڕی دەشێلا دەیکرد بە سەبیل، کراویشی دەکرد، دوکانەکی لۆ کوڕی پاشا دانا ڕەسمێکی خۆی کرد، لە دوکانەکەی دا، لەبەر خاتری رەسمەکە عالەم دەچوون سەبیلیان دەکرێ و دەیان شکاندو دەچوون یەکی دیان دەکڕیەوە، و یان کراویان دەکڕی و دەیان سوتاند و دەچوون یەکی دیکەیان دەکڕی، کوڕی پاشا وا دەوڵەمەند بوو دەنگی داوە لەو شارە، تا رۆژەکی کابرایەك هات سەبیلەکی کڕی، لەگەر کراوێك راست بردی و ڕۆیی، تومەز ئەو کابرایە خزمەت کاری بابی ئەو جارییە بووە، ناوبانگی ئەو سنحاتەی بیستیتەوە هەرستایە کابرایەکی ناردوە لۆ ئەوەی سۆراغی لۆ بباتەوە کە کراوەکە و سەبیلەکەی برد، دیارە ئەو کیژە کیژی پاشا بووە و بەگەر جاریان کەتیە، پاشاکە دیتی گۆتی بەرێ ئەوە هەوە کیژی



منە، ئەوجا پاشا هەرستا پارەیەکی زۆری بە پیاوانی نارد لۆ لای کوڕی پاشا کە کیژی لەلایە، چوونە ئەوێ، بە کوڕی پاشایان گۆت ئێمە هاتینە لۆئەوەی ئەو جاریەمان پێ بفرۆشیەوە، کوڕی پاشا گۆتی باشە دەیفرۆشم، جاریەکە پێی گۆت پیاوی باش بە من مفرۆشە، کوڕی پاشا گۆتی لۆ نەتفرۆشم تۆ کاتی خۆی جاریە بووی من کوڕی پاشا تۆم کڕی هەنوکەش دەتفرۆشم. بە پاریەکی زۆر فرۆشتی و گۆتی من بەیانی دەچم کیژە پاشایەك دێنم، جاریەکە پێی گۆت پەشیمان دەبیەوە و زەرەریش دەکەی، کوڕە پاشا جاریەی فرۆشت ئەوجا قەدەرعەیامێکی زۆری پێ چوو کوڕی پاشا زۆر فەقیر و رەزیل بوو، کەلکی ئەوەی نەما لەو شارە دانیشێ هەرستا ڕۆیی رووی کردە شارێکی دی، لەوێ دەگەڕا دەیگۆت کاسبی دەکەم ڕەنجبەری بێ، هەرچی بێ دەیکەم، پاشای ئەو شارە بابی ئەو جاریە بوو کە خێزانی ئەم کوڕە بوو کە فرۆشتی پاشا گۆتی وەرە ببە قازەوانی من، لەلای قازان بوو رۆژەکی قازێکی قاچ شکاند، قازەکەی سەربڕی و زۆر بە شەرمەزاریی قازەکەی بردەوە ماریێ ئێوارە قازەکەیان لێنا عادەتی قازەوانیش وابوو دەبوایە لەناو قازەکان بنووی و جاریەش شکی کردبوو ئەوە، پیاوەکەی خۆیەتی گۆتی ئێوارێ من نان لۆ قازەوان دەبەم، نانەکەی لۆ برد لەپێش دەمی دانا، کابرای قازەوان لەشەرمان زۆر ناڕەحەت بوو، جاریەکە پێی گۆت نانەکەت بخۆ هیچ ناڕەحەت مەبە ئەدی من پێتم نەگۆتی مەمفرۆشە پەشیمان دەبیەوە، من ئەوجاریەمە هەرکە تۆ منت فرۆشت، پێی گۆت خۆت ئاشکرا مەکە هەتا من دەچمە بازار دوو قاتی زەلامانە بەڕادان دەدەم لۆ هەردووکمان، جاریەکە قاتەکانی بەڕادان داو هەرکە دوورا هینایەوە ئێوارەیەك بە قازەوانی گۆت، هەرستە با خۆمان سازبدەین، چوون لە تەویلەی ماری بابی دوو ماینی چاکیشیان هێناو هەریەکەی شیرەك و ڕمەکیشیان هەرگرت و سواری ماینەکان بوون و رۆیشتن، جاریەکە بە پیاوەکەی گۆت، ئەتو بنوو من دادەنیشم، هەتا کابرا تێر خەو بوو، ئەوجا جاریەکە گۆتی من دەنووم و ئەتو دانیشە بەس بە یەك شەرت دەست لە لەش و لاری من نەدەی، جاریەکە سەری کردە سەر رانی پیاوەکەی خەوی لێ کەوت، پیاوەکەی داڵغە

و فیکرەك بەمێشکی داهات، قولابەیەك بەقەد یەخەی ژنەکەوە بوو، کابرا قولابەکەی لێ کردەوە لە عەردەکەی دانا، تەیرێك لەو لاهات قولابەکەی برد و ڕۆیی کابرا ژنەکەی بەجێ هێشت و کەوتە دوای تەیرەکەو، تەیر لە ئاسمان و کابراش لە عەرد ناگات پێی، کاتەك ژنەکە بەخەبەرهات دیتی دوو زەلام وا شەڕیانە پێیانی گۆت، ئێوە لۆ شەڕ دەکەن گۆتیان وەڵڵاهی لەسەر تۆیە، جاریەکە گۆتی ئەوە تەگبیرێکی زۆر ئاسانە من مەرجەکتان لەبەینتان دادەنێم من ئەو تیرە هەردەدەم هەرچیتان ئەو تیرەتان هێناوە من لۆ ئەوتانم، ئەوی دیش شیرو ماینەکان لۆ ئەو. تیرەکەی هەردا ئەوان کەتنە دوای تیر ژنەکە هەرستا و خۆی پێچاو سواری ماینەکەی بوو ڕۆیی، لەگەر بانگی عیشا دا گەیشتە شارەکە ئەو شارە یەك دەرگەی هەبوو ئەو گەیشتە بەر دەرگە، دەرکەوان دەرگەی قەپات کرد، چەندەی هاوار و بانگی لێ کرد دەرکەم لێ بکەنەوە دەرکەوان دەرگەی لێ نەکردەوە، دەرکەوان پێی گۆت، بەشەو دەعبایەك بەو شارە فێربووە هەرشەوێ زەلامەك دەخوا، ئەم شەو نۆرەی کوڕی پاشایە با تۆ بخوا لە باتی کوڕی پاشا، ئەوجا ناچار بوو گۆتی ئەی خودایە من چیم بەسەرهات لە چنگی ئەو پیاوە، چوو لە قەراغی شارەکە پاری دایەوە، لە ترسان هیچ خەوی لێ نەکەوت، لەو مەوعیدەی دەرکەوان پێی گۆت شەوێ دەعبایەك دێ، شتەك دەهات ڕۆناکیەکی لەپێش بوو وەك لایت، ئەویش تیروکەوانێکی پێ بوو، لە ترسی خۆی حازری کردبوو، کاتێك ڕۆناکیەکە هاتە پێش دیتی دەعباکەیە کە دەرکەوان وەسفی لۆ کردبوو، ئەویش ناوی خوای لێ هێنا و، گۆتی: هەرفەوتامە، باتیرێکی تێ بگرم، تیرێکی هاوێشت بەرچاوی کەوت ئاگرە کوژاوە. دەستی دا شیرەکەی چووە سەری تەماشای کرد دەعبایەك بوو دەعبای وای قەت نەبوو هەرستا هەردوو گێی لێکردەوەو، چوو لە دووری شار ماینەکەی داکوتا و بەستایەوەو لێی خەوت، بانگی بەیانی دا عالەم هەموو هەرستان لۆ نوێژ گشت و سوئالیان دەکرد کوڕی پاشا مایە؟! هەتا چێشتەنگاو دەرگایان نەکردەوە، عالەم لەسەر خانی تەماشایان دەکرد، دەیانگۆت ئەها بزانێ ئەورۆ کەسی نەخواردوە چۆن پاری دایتەوە، وایلێهات خەرکی بێ سحەت



بوون، گۆتیان دەرکەی شار بکەنەوە بزانین لۆ لەوێ پاری دایتەوە، هەرستا کابرایەکیان هێنا عومری لە هەشتا سار بەولا بوو پێیان گۆت تۆ بابی خۆت دنیات دیتوە بڕۆ بزانە ئەو دەعبایە لۆ لەوێ کەوتیە کابرا ڕۆیی چووە سەر دەعبایەکە تەماشای کرد کوژراوە، لەخۆشیان دەستی بە هەرپەڕکێ کرد گۆتی وەرن کوشتومە ئیدی خەڵکان هەموو چوون تەماشایان کرد ئەوە هەردوو گێی بڕایە، بەکابرای پیرەمێردیان گۆت، ئەوە هەردوو گێی بڕایە، عالەمەکە خڕ بوونەوە گۆتیان وەرن بزانین کێ ئەو پیاوەتیەی لەگەڵمان کردوە، دەرکەوان گۆتی ئێوارێ لەکاتی دەرکە پێوەدان سوارێك هات هەرگیز سواری وام نەدیتبوو، گەلێك هەوڵیشی لە گەرم دا دەرکەم لێ نەکردەوە هەبێ‌ونەبێ هەر ئەوە، ئەوجا پاشا گۆتی دەمەوێ ئەو سوارەم لۆ ببندرێتەوە، گەڕان سوارەیان دیتەوە، گۆتیان کاکە وەرە بچینە کن پاشای شار، گۆتی من کابرایەکی نەناسم ئیشم چییە لەلای، پاشان پێیان گۆت کاکە پاشا هەر دەتیەوێ ئەوجا هیچ عەزیەتمان مەدە، وەرە بڕۆین لۆلای پاشا، بەگەریان کەت و ڕۆیی لۆلای پاشا، پاشا بەخێرهاتنێکی گەرمی کردو گۆتی: بزانم ئەسل و فەسڵی تۆ چییە ، گۆتی پاشا من ڕێڕەوم ئەمڕۆکە ڕێم بەوناوە کەوتیەو نازانم هاتنی منت لۆچییە؟ پاشا گۆتی: من پاشای ئەم شارەم دەعبایەك بەو شارە فێرببوو هەرشەوێ زەلامێکی دەخوارد، ئەو شەو نۆرەی کوڕەکەی من بوو لۆیەکە دەمەوێ بزانم کێ ئێمەی لە دەست ئەو دەعبایە دەربازکردییە ئەوجا گۆتی چ ناونیشانێکت دەوێ تا بزانی کێ ئەو دەعبایەی کوشتوە، پاشا گۆتی: ئەوەی ئەو دەعبایەی کوشتووە هەردوو گێشی بڕیوە، ئەوجا هەردوو گێیەکەشی لە باغەری دەرهێنا و دایە دەست پاشا، ئەوجا پاشا گۆتی مادام تۆ ئەو پیاوەتیەیەت لەگەر ئێمە کردووە، من کیژێکم هەیە دەبێ لێمی قەبول کەی، سوارەکە گۆتی پاشا لێت قەبول دەکەم و دەیدەمەوە خۆت، من کەلکی ژن خواستنم نییە، پاشا هەروازی لێ نەهێنا هەرستا کیژەکەی دا پێی، سوارەکە گۆتی: پاشا لێت قەبول دەکەم من عادەتم وایە هەتا سێ مانگی دی کەلکی زەماوەندم نیەیە، پاشا قبولی کرد، سوارەکە بوو بە کوڕی پاشا، پاشا هەرستا لەجێی خۆی کردی بە پاشا، سوارەکە کە بوو بە پاشا

رەسمێکی ئافرەتەکەی خۆی لە دەرکەی شارەکەدا هەلواسی بەدەرکەوانەکانی گۆت هەرکەسێك هات تەماشای ئەم رەسمەی کرد بیهێننە لای من، کەس نەیدەزانی رەسمی ئافرەتی خۆیتی هەروایان دەزانی پیاوە، رۆژێك دوو زەلام هاتن چاویان بە رەسمەکە کەت زۆر پەرێشان بوون کابرای دەرکەوان پێیانی گۆت لۆ هێندە بە دیتنی ئەو رەسمە تێکچوونە؟ وەرن بابتانبەمە لای پاشا، هەردووکیانی بردە لای پاشا، پاشا پێیانی گۆت: ئێوە لۆ بە دیتنی ئەو رەسمە پەشۆکان؟ گۆتیان: پاشامان خۆش بێ ئێمە زەرەرمەندێکی زۆر بووینە لەناوچەوانی ئەو رەسمە، پاشا فەرمووی بیانبەن بزانن چ زەرەرێکیان لێ کەتیە لۆیان ببژێرن، پاشا چۆن بزانێ ئەو دوو کابرایە بوون کە ئافرەتەکەی بوو تیرەکەی لۆیانی هەردا، رۆژێکی دی کابرایەك هات و چاوی بە رەسمەکە کەوت هەرچەند تۆز و خۆڵی ئەو ناوە هەبوو بەسەر سەری خۆی دا کرد، دەرکەوان پێی گۆت تۆ لۆ وادەکەی؟! کابرا وەڵامی داوە، گۆتی: ئەو رەسمە رەسمی ژنەکەی منە، هەرستان بردیان لۆ لای پاشا، پاشا تەماشای کرد، پیاوەکەی خۆیەتی، پێی گۆت: تۆ لۆ وەها گریای خۆرت بەسەر خۆتدا کرد، گۆتی پاشا ئەو رەسمە رەسمی ژنی منە من عەودالّم بە دوو ئەو رەسمە، پاشا گاسی پاسەوانانی کرد، پێی گۆتن ئەمەم لۆ بەند بکەن بەینێك لەوێ بەند کرا. پاشا گۆتی: لۆم بیننەوە، پاشا بە کابرای گۆت: ئەگەر تۆ ژنەکەی خۆت ببینی دەیناسیەوە؟ (لە هەمان کاتدا پاشا لۆخۆی ژنەکەیە) پاشا گۆتیە دەرکەوان کەس نێتە ژوورێ دەرگای کلیل دا، پاشا (ژنەکە) هەرستا جلەکانی لەبەر خۆی داکەند و بەرگی ئافرەتانی لەبەرکرد، پێی گۆت کابرا ئەگەر ئەتو ژنەکەی خۆت ببینی دەیناسیەوە، کابرا گۆتی، پاشا لە رووی تۆوە بێ ئەدەبی نەبێ، ئەتۆ هەوی، ئەوجا پاشا پێی گۆت بەرێ من هەوم ئەی وەك من نووستم نەمگۆت دەست لە لەشی من مەدە، کابراش بەسەرهاتەکەی لۆ گێڕاوە کە بەدوای قولابەکەدا چووە، ئەوجا بەیەکەوە چوونە ماری پاشا بە خەزوری گۆت من لە رووی تۆ قسەکم هەیە، ئەگەرچی ئەو کیژەی خۆت دایتە من، بەڵام من ژنم ، ئەوکابرایەش مێردی منە، ئەگەر لێمانی قەبول بکەی پاشایەتیەکە با هەر لۆخۆت



بێ، پاشا فەرمووی تۆ ئەو جۆرە ژنەبی ئەوکابرایەش مێردی تۆبی، دەبێ لە تۆ بەکارتربی، لۆیە ئەوە منیش کیژەکەی خۆم پێشکەش بەو کرد، ئەو پاشایەتیەش قابیل بەوبیە، ئەوجا کابرا بە ژنەکەی خۆی شاد بۆوە و کیژی پاشایشی گواستەوە و بووە بە پاشاش لەو شارە، ئەوجا قەلە رەشکە گۆتی: جا ئەوە هونەری پیاوەکە بوو یان هی ژنەکە بوو، ئەی پیر و پێشینان نەیان گۆتیە ژنیش هەیە و ژانیش هەیە. پیاوەکە گۆتی: تووتی وەرە قەلە مارەکە، ئەوجا قەلەیان مارەکرد لە تووتی و زەماوەندێکی خۆشیان لۆ گێڕان.

## کراشم درِا و چم پێ نەبڕا

-------------------------------------

※ گێڕانەوەی ئەم هەقایەتەم لەسەر زاری (عەلی شێخە) تۆمارکردووە، لەدایك بووی ساڵی (١٩٤٠)ەو دانیشتووی شاری هەولێرە.

※ لە گۆڤاری پەیامی راستی ژمارە ٧٢ لە ٥ی مایسی ٢٠٠٥ بلاوکردۆتەوە

## سێ برا

دەگێڕنەوە دەرێن کابرایەك هەبوو سێ کوڕی هەبوو، ئەو کابرایە ئەو سێ کوڕی بە فەقیری و بێ داکی بەخێو کردبوو، کوڕەکانی زۆر زۆر خۆش دەویست هیچی بەبێ دری ئەو کوڕانە نەدەکرد. دەرێ ڕۆژەك لە ڕۆژان بابی گاسی کردن گۆتی: وەرن کوڕم وەسیەتەکتان لەبۆ بکەم دنیایە ئەگەر مردم ئەو وەسیەتەی من بەجێبگەیەنن دەرێ ئەوانیش هاتن دانیشتن لەکنی گۆتیان فەرموو بابە چ وەسیەتەکت هەیە، گۆتی:کوڕم ئەوە دونیایە ئەمن دەمرم پاش تازیەکەی من هەر شەوێ یەکەکتان وەرنە سەر قەبرەکەم.

دەرێ ئەوانیش دری بابیان نەشکاند گۆتیان باشە بابە بەسەر چاوان ئینشاڵڵا قەت نامری بەران شەرت ئەگەر مردی هەر شەوێ یەکمان بێینە سەر قەبرەکەت، گۆتی باشە، دەرێ کەم و زۆر بابەکەیان نەخۆش کەوت هەر چەندی هەوڵیاندا حیلاجیان پێ نەکرا حیلاجی نەبوو بابەکەیان ئەمری خوای کرد سێ برایەکە بەتەنیا مانەوە، هەرسێکیان داکیشیان نەمابوو، دەرێ تازیەو مازیە فاتیحا خەلاس بوو هاتنەوە مارێ- لەمارێ برا گچکەکەیان گۆتی برام ئەدی وەکی بابم هێشتا نەخۆش نەکەوتبوو وەسیەتی نەکردبوو گۆتی ئەگەر مردم تازیەکەم خەلاس بوو ، هەر شەوێ یەکەکتان وەرنە سەر قەبرەکەم، دەرێ برا گەورەکەی گۆتی: کوڕە دەبڕۆ بابت خەلفابوو خۆ ئەتۆ نەخەلفای هەی حەیوان تازە باب مردو رۆیی و چ ناکرێتن بچینە سەر قەبرەکەی بەو شەوەی چ بکەین. دەرێ برایەکەی گەڕا گەڕا لەمارێ کەچە شیرۆکەکی هەبوو کەچە



شیرۆکەی دیتەوەو لەملی خۆی کردو لۆسەر قەبران چوو، تەماشای کرد لە دوورڕا شتەکی دیت لەناو قەبرستان راوەستابوو، ترسا لەشتەکەی، گۆتی دەبی ئەوە چ بی دانیشت تەماشای کرد. وراغە لێی نێزیك بۆوە، تەماشای کرد ماینەکە بەزین و لغاوەوە حازر لەسەر قەبرەکەی بابی راوەستایە دەرێ لۆ کنی چوو ماینەکە کلکی لۆبادا مەعناکە عیشارەتی دایێ مەترسێ وەرە هەریش نایێم دەرێ چووە کن ماینەکەی. ماینەکەی گرت. فاتیحایەکی لۆ قەبرستانەکە و لۆ بابی خیند. سواری ماینەکە بوو بە زانایی هاتەوە مارێ بردی ماینەکەی لە خانیەکی بەتار بەستاوە دەرکەی لەسەر پێوەدا کەسنەزانی، چۆوە ژۆرێ و خۆی لە بن جێیەکەی نا هەتا سبەینێ نووست سبەینێ هەستان چایۆکەیان لۆ خۆیان لێناو نانیان هینا و نانیان خوارد و برایە گەورەکەی گۆتی: ها کوڕم چوویە سەر قەبری بابت گۆتی: بەرێ، گۆتی: چ بوو. گۆتی: وەڵڵا چ نەبوو، فاتیحایەکم لۆ بابم خیند و هاتمەوە، ئێ گۆتی: دە باشە، خوا خێرت بنووسی، دەرێ دیسان ئێوارێ دانیشتنەوە و برا گچکە گۆتی: ئەدی بابم نەیگۆت ئەگەر مردم ئەنگۆ هەر شەوێ یەکتان وەرنە سەر قەبری من، گۆتیان ئێ کوڕە بابت تێکچووبوو خۆ ئەتو تێکنەچووی باب مرد، مرد، رۆیی. رۆیی تازە خۆ باب نایەتەوە ئەگەر بچین خۆ لە قوڕێ نێین، هەرچییەکی بکەین بچینە سەر قەبری، نەچینە سەرقەبری لە مارێ فاتیحای لۆ دەخینین خێری لۆ دەکەین ئەوە رۆیی، گۆتی باشە، دەرێ دیسان شیرۆکەی دەست دایێ رۆیی تا گەیشتە سەر قەبران دەرێ ئەو جارە ترسی شکابوو، دیسان تەماشای کرد عەینی وراغەکی لەوی جوانتر لەسەر قەبرەکەی بابی راوەستابوو، گۆتی: ماشەڵڵا خوایە دەبی شتەك هەبی ئەو بابەی من ئەو وەسیەتەی بەلاش نەکردیە یا رەبی خوایە بەخێری بگێڕی، دەرێ دیسان چووە کن ماینەکەی ماینەکە کلکی لۆ هەرلەقاند سەری لۆ لەقاند چو ماینەکەی گرت دیسان فاتیحایەکی لۆ قەبرستانەکەی و فاتیحایەکی لۆ بابی خیند سواری وراغەکەی بوو، وراغەکەی هیناوە و بردییە کن وراغەکەی دی.

لەناو خانیەکە بەستایەوە و بە دزی دەرکەی کردەوە و چووە سەر جێیەکەی خۆی پاری داوە نووست، دەرێ سبەینێ گاسیان کرد هەستا هات دیسان دانیشتن نانیان خوارد و لۆ خۆیان دەستیان بە قسان کرد. دوایی هەریەکەی چوونە جێیەك یەك لۆ دیوەخانێ رۆیشت، یەك لۆ مزگەفتێ یەك چووە پیاسەی ناو گوندی هەتا نیوڕانێ، دەرێ نیوڕانێش هاتنەوە و نانیان خوارد و پەرتەیان لێکرد و هەتا ئێوارێ، ئێوارێ هاتنەوە مارێ، دیسان نانیان خواردو برا گچکە گۆتی: ئەرێ ئەنگۆ خۆ کەستان ناچنە سەر قەبران فاتیحایەکی لۆ بابم بخینن وەنییە، گۆتیان ناوەڵڵا ئەمە ناچین، ئێ گۆتی دەباشە ئەو شەویش ئەمن دەچم بە تەمای خوای دەبی وەسیەتەکەی بابم تەواو بکەم ئەوجا چ دەبی با ببیتن دەرێ سێیەمین شەویش بەو نەوعەی کە لێیدا رۆیی، چووە سەر قەبران دیسان تەماشای کرد عەینەن وراغەکەی لە هەردووکیان جوانتر لەسەر قەبرەکەی بابی راوەستایە، ترسی شکابوو لە وراغەکان دەیزانی وراغەکان نارۆن، دەرێ چوو عەینەن ئەو وراغیشی گرت، فاتیحای لۆ قەبرستانەکە و لۆ بابی خیند، سواربوو هاتەوە ئەویشی لەکن وراغەکان بەستاوە لەناو خانی لەکن کەس دەنگی نەکردییە خوا نەبی قەت کەس نازانی، دەرێ لۆ چارەمین شەویش شەوی، گۆتی وەڵڵایی برام قایدی وایە وەسییەتەکەی بابم بەجێ بگەیەنن یەکتان هەڕوونە سەر قەبران، گۆتیان: وەڵڵا کاکە ناچین ئەتوو کو لۆ خۆت چووی ئەوها لۆ خۆت هەڕووە سەر قەبران و وەرەوە، گۆتی: باشە، دەرێ شەوی چارەمین کە چووە سەر قەبران تەماشای کرد ئەوە دێوەك قەبرەکەی بابی هەردەدڕی خۆرەکەی هەموو لابردییە هەر ئەوەندە مایە بیگەینتە ئەلحەدەکە و ئەلحەدەکەی لا ببە و بابی بهینتە دەرێ و بیخوا دەرێ لە دوڕا دەنگی لە دیوەکەی کرد نەوێرا بچیتە سەر شیرەکەی راوەشاندە دێوەکە و لە لاقی دێوەکەیدا لاقی شکاند دێوە هەرات کەوتە دوو دێوەی ها لێرە ها لەوێ بردی بڕۆ بردی بڕۆ بەو شەوەی دەرێ کاتەك دێوە راوەستا ئەویش راوەستا نەوێرا بچیتە سەری دێوەکە لەجێی خۆی نقووم بوو رۆیی چووە جێیەکەی تەماشای کرد بەردەکی گەورەبوو بەردەکەی پێ لانەچوو تاقەتی بەردەکەی نەبوو، گۆتی: وەڵڵایی



دێوە چووە بن ئەو بەردەی دەبی لەبن، ئەو بەردەی چ هەبی گۆتی: وا چاکە بچمەوە مارێ سبەینێ بە برایەکانم برێم بێین ئەو بەردەی لابەین بزانین ئەو دێوەی دەرینین بیکوژین، دەنا ئەوە سبەینێ شەوێ بابم دەخواتن، دەرێ زۆر عاجز بوو هاتەوە مارێ بە عاجزی خۆی لەبن جێی نا پاری داوە، سبەینێ هەستان نانیان خوارد گۆتی: ئەرێ برام گۆتیان: ها، گۆتی قسەکی دەکەم توخوا بە شێتم مەگرن، گۆتی: ئەنگۆ کە بابم ئەو وەسیەتەی لۆمە کرد قەشمەریتان بە وەسیەتەکەی بابم هات ئەمن وەسیەتەکەی بابم بەجێگەیاند ئەمن سێ شەوان چوومە سەرقەبری بابم سێ ماینم هینایە یەك لە یەکێ جوانتر بەس ئەوشۆی کە چوومەوە سەر قەبری بابم دێوەك دەیویست بابم دەربینی و بیخوا لاقیشم شکاندییە کەوتیمە دووشی لۆم نەگیرا بەردەکی گەورەی هەرداوە چووە بن بەردەی بەردەکەم پێ لانەچوو ئەوجا ئەلحان لەگەر برای خۆتان وەرن با بچین ئەو بەردەی لا ببەین کوڕە دەنا ئەو دێوە بابمان دەخواتن، ئەوانیش دەرێن وەڵڵایی ئەگەر ماینەکانت هینابیتن ئەوە قسەکانت راستە و ئەگەر ماینەکانیشت نەینابی ئەوە درۆیە لۆ خۆت خەیارە ئەوە ترسای، گۆتی دەهەستن وەرنە دەرێ، دەرێ دەستی برایەکانی گرت و دەرکەی خانییەکەی کردەوە تەماشایان کرد سێ ماینی لێ بەسترایتەوە هەر ماینێ لە ماینەکێ جوانترە، گۆتیان: کوڕە وەڵڵایی ئەوە قسەیتی مادام وایە ئەو دێوە راستە، ئەو دێوە بابمان دەخوا چووە کێندەرێ گۆتی: وەڵڵا رۆیشتن وەرن پێتان پیشاندەم دەرێ پێشیان کەت ئەوانیش قەزمە و خاکەناس و باریە و پێمەڕەیان دەستدایێ رۆیشتن هەتا چوونە کن بەردەکەی تەماشایان کرد بەردەکە گەورە بوو، دەرێ بنی بەردەکەیان کۆری و بنیان داوە دەست و مەستیان لێ گیربی یا شتێکی لێ گیر بی باریەی لێ گیربی دەرێ بەردەکەیان لابرد بەهەر نەوعەکی بیت، وەکی بەردەکەیان لابرد تەماشایان کرد، کەونە بیرە ئەو دێوە کە چوویتە ناو ئەو کەونە بیرە، مەعنای وایە لەبنی بیرەکەیە برۆن کوڕە کندڕی بینن، شتەکی بینن دەرێ غاریاندا، هاتنەوە مارێ یەکێکیان لەوێ بەجێما، لە دیار بیرێ، کندڕیان هینا ئەو گۆتی وەرە ئەتوو بڕۆ خوارێ شۆڕت دەکەینەوە ئەو گۆتی: ئەتوو وەرە بڕۆ خوارێ

شۆڕت دەکەینەوە- دەرێ دوو برایەکەی نەوێران بڕۆننە خوارێ شۆڕببنەوە، گۆتی: وەڵڵا کاکە ئیشەکم کو کردیە هەر ئەمن با بیکەم- وەرە ئەنگۆ ئەمن شۆڕبکەنەوە بەس ئیشارەتمان ئەوەبی گەر گوریسەکەم رالەقاند رامکێشنەوە ئەگەر رامنەلەقاند شۆڕمکەنەوە، گۆتیان: باشە دەرێ شۆڕیان کردەوە. دێوەی لێ بەدەرکەت دێوە پاری دابۆوە سێ کیژی لەکنە خۆی دانابوو سەری بە رانی یەکەکی کردوو یەك لاقی دەشێلا یەك پشتی دەشێلا- بەشەربوون، سێ کیژەکە، دەرێ کیژەکان تەماشایان کرد زەلامەك هاتە خوارێ لۆ ناو بیرێ، وا لە سەرڕا دێتە خوارێ گۆتیان: وەڵڵایی ئەوە زەلامە ئەوە بنیادەمە بێتە خوارێ بەو دێوە ناوەستی ئەو دێوە دەیخواتن دەستیان لێ هەروەشاند کوڕە چیتر نێیە خوارێ، بگەڕێوە، گۆتی: وس بن تا دەگەمە عەردی ئەوجا کە گەیشتمە عەردی ئیشی دەبینم عیلاجی دەکەم، دەرێ هەر شۆڕبۆوە تا پێی گەیشتە عەرد ئەوجا گوریسەکە چیتر نەهاتە دووی راوەستا گۆتی ئەنگۆ مەترسێن دێوەی دەکوژم. دەرێ شیری لێ هەرکێشا لە تەپری سەریدا سەری شەق کرد شیرەکەی دیکەی لێدا بەو جۆرە هەتا دێوەی کوشت، دەرێ کیژەکان خۆیان پێوە شۆڕکردەوە گۆتیان: ئەوە فریشتە بووی لۆمە هاتیە خوارەوە، ئەوە چ بووی لۆمە هاتیە خوارەوە، ئەو دێوە چەند سارە ئەمەی هینایتە ئێرە ئەمە منداربووین هەتا ئێستا ئاوا جاعێر بووین، گۆتی: جاعێر بووینە، گۆتیان: بەرێ، گۆتی: بابتان، براتان، خزمتان، کەستان داکتان، کێ دەناسن، برێن تا تەسلیمتان بکەینەوە، یەك گۆتی حەفت مانگان بوویمە ئەمنی فڕاندیتە ئێرە، یەك گۆتی: سارەك بوویمە ئەمنی هینایتە ئێرە، یەك گۆتی: ئەمن چار مانگ بوویمە ئەمنی هینایتە ئێرە، گۆتیان نە بابمان دەناسین، نە داکمان دەناسین، نە خارمان، نە برامان کەسمان ناناسین، گۆتی: مەعنا بێ کەسن، ئەنگۆ کەستان نییە، گۆتیان: ئەرێ وەڵڵا گۆتی: ئەوجا مادام تەگبیرەکی دەکەین، گۆتیان چییە، گۆتی: ئەمە سێ براینە، ئایا ئەنگۆ رازینە، ئەمە دەرتا بینین هەریەکە و یەکەتتان لەخۆ مارە بکەین، گۆتیان: بەرێ ئەمە رازینە ماتتو نەجاتمان بوو لە دەست دێوەی، گۆتی: گوریسی شۆڕکەنەوە، گۆتی: کیهانتان لە هەمووتان گەورەترە، گۆتیان



ئەوە گۆتی گوریسی لە تەنگەی وی یەخست، گۆتی: رایکێشن بەسەری بێخن ئەوە لۆ برای گەورە، رایانکێشان گران بوو، راکێشە، راکێشە هێنایانە دەرێ تەماشا دەکەن کیژەکی جاحێر، ئێ، شۆڕکەنەوە گوریسی دەرێ گوریسیان شۆڕکردەوە، لە ناوقەدی لەوی گچکەتری یەخست، گۆتی: ئەوە لۆ برای ناوەنجی- دەرێ رایانکێشا راکێشە، راکێشە ئەویشیان بەسەر یەخست، برایەکانی گۆتیان: بزانە ئەو برایەی مە چەند سەگە کیهان جوانەکەیە لۆ خۆی یەشتیتەوە ئەوانەی لۆمە رەوانە کردییە، مەعنا ئەوانە یەکە و یەك لە خۆمان مارەکەین، تەگبیریان کرد گۆتیان: با رایکێشین وەکی برایەکەمان راکێشا هەتا نیوەی رێمان هینا لە بیرەکەی گوریسەکەی لەسەر بپسێنین راست بەری دەینەوە ناو بیرەکەی با تێدا بمرێ، بەردەکەشی لەسەر دانێین، دەرێ کیژەکە کە گێی لێ بوو لە بن بیرێ، گۆتی: کوڕە وەرە ئەتوو پێشی من بڕۆ دەرێ برایەکانت حەفت و هەشتیانە، گارە گاریتیان لەسەر من دوایێ بەرت دەدەنەوە ناو ئەو بیرەی، لەناو بیرە دەمری، گۆتی: برای من کو ئیشی وا لەگەرە من دەکەن، ئەمن برای ئەوانم ئەوان بە چ ماندی نەبوونە، ئەمن بەوان ماندیی بوویمەوە وەرە ئەتوو جارێ بەسەرکەوە، ئەوجا ئەمن دوایێ دێمە دەرێ، گۆتی: کوڕە وەرە پیاوی باش بە ئەتوو پێش من بڕۆ دەرێ با راتکێشنە سەرەوە چونکە ئەمن لە خوارەوە بمینێم ئەتو بەرنادەنەوە، گۆتی: نا برای من ئیشی وا لەگەرە من ناکەن، گۆتی: قسەکت لۆ بکەم گۆتی: بەرێ فەرموو- گۆتی: ها ئەو ئەنگوستیلەت پێ بدەم لەکنت بی. ئەو کونەی کە دەبینن ئەلێرە دەڕوا ئەو کونە دەچیتە سەر بەحرێ، بەحرەکە، نە چاو حەرەکەی لێ دەکا نەبنیشی دیارە- ئەگەر دنیابوو ئەتوویان بەرداوە ناو ئەو بیرەی لۆ خۆت بەو کونەی دابڕۆ هەتا دەگەیە بەحرەکەی مێرگ و کانیەکی خۆش، گیایەکی زۆر، بەهارەکی خۆش لەوێندەرێ یەکسەر بگەڕێ مریشکەك بە جوجکەوە لێیەتی مریشکەکە لە زیویە و جوجکەکانیش لە زێڕی روحیان لەبەرە ساغن، بە شوڕی قەفەزیان لۆ دروست بکە و مریشکەکە و جوجکەکان لەناو قەفەزەکەی بکە، ئەوجا قاتەکیشی لێیە ئەویش ببینەوە قاتەکەشی هەر نەبڕایە و نەدورایە کەپسە، دوایی

ئەوە لەوێندەرێ تاقیبی رۆژی سێ شەمووان بکە، رۆژی سێ شەمووان دوو بەرانی قۆچداری گەورە دێنە سەر ئەو بەحرەی لە بۆ خۆیان دەست بە لەوەڕێ دەکەن تێر گیا دەخۆن، هەتا زگیان بەسەر پشتێ دەکەوی، وەکی زگیان بەسەر پشتی کەت تێربوون دەچن مل بەبەر ئاوێ وەدەنێن تێر ئاو دەخۆنەوە، وەکی تێریشیان ئاو خواردەوە دەست بەشەڕە قۆچانێ دەکەن وەکی دەستیان بەشەڕە قۆچانێ کرد زۆر ماندی دەبن، خێن لە دەو و لە کەپویان دێتە خوارێ پەکیان دەکەوێ واز لە یەك دەینن، وەکی وازیان لەیەك هینا سواری ملی بەرانە سپییەکە بووی دەتهینتەوە سەر دونیایێ سواری ملی بەرانە رەشەکە بووی چەند لە بنی عەردی ئەوەندەی تر دەتباتە بن عەردی گۆتی باشە، دەرێ گوریسەکەیان شۆڕکردەوە لە تەنگەی کیژەکەی یەخست، کیژەکەی بەسەر یەخست وەکی بەسەر یەخست برایەکانی لە سەرەوە بەشەڕهاتن ئەو گۆتی: دوو ژن لۆ منە ژنەك لۆ تووبی ئەو دەیگۆت دووژن لۆ منە ژنەك لۆ تووبی، ئەویش هاواری دەکرد، دەیگوت: بابە جارێ گوریسەکەی لۆ من شۆڕکەنەوە، ئەمن بەسەر بێخنەوە، گۆتیان بەسەرت دێخینەوە وەڵڵا دەبی بمری، لە بنەبانێ، بەردەکەشیان بەسەر داداوە لە بن بیری ماوە، خەبەریاندا قراری گاوری گۆتیان شەڕە لەسەر ئەو کەونە بیرەی بڕۆن بگەنێ بزانن چییە، قراری گاوری ئەمری کرد گۆتی: بڕۆن بزانن ئەو شەڕە لەسەر چییە، دەرێ عالەم غاریاندا چوون تەماشایان کرد، دوو زەلام و سێ ژن. راوەستاینە لەکن بیرەکی کوڕە ئەوە چییە گۆتیان: ئەو سێ ژنەمان لەناو بیری دەرهینایە، ئەمن دەرێم دوو ژن لۆ من ژنەك لۆ تو. ئەویش دەرێ دوو ژن لۆ من ژنەك لۆ تو. گۆتیان یاڵڵا قۆڕبەستیان کردن، بردیانە کن قراری گاوری، دەرێ قراری گاوری کە تەماشی کرد کیژەکە زۆر جوان بوو. کوڕەکی هەبوو تەماحی لێگیربوو. گۆتی بابم، ئەنگۆ ئەو ژنانە پارەو پێ نەدایە و ژن بە ژنی و پێ نەکردیە و دیتیتانەوە لەناو بیرێ. یەك و ژنی لۆ خۆتان ببەن و ئەو کیژەش لۆ کوڕی خۆمە. لە کوڕی خۆمی مارە دەکەم. خواحافیزتان بی، ئەوانی دەرکرد و کیژەکەی لۆ خۆی برد. لە کوڕەکەی خۆی مارەکرد و پیرەژنەکیان کردە خزمەتکاری ئەو کیژەی کە لەکنی



ئیش بکاتن نانی لۆ بینی نانی لۆ بباتن و چایەی لۆ بینی و ئاوا خزمەتی بکاتن دەرێ رۆژەکیان کیژە گۆتیە پیرەژنەکەی گۆتی: وەرە بڕۆ بە زاوای برێ ئەمە عادەتەکمان هەیە، کە مێردمان کرد هەتا چل رۆژان نابێ زاوا بێتە کن بوکێ مەخسەدی بوو لەو قسەیەی ئەلێرە مەخسەدی ئەو کیژە ئەوەیە کە بزانی ئایا ئەو کابرایە بەو چل رۆژە پەیا دەبیتەوە ئەگەر نێتەوەش مەعنا فەوتا نایەتەوە.

مەخسەدی ئەوەندەبوو، دەرێ خزمەتکارەکەش چوو بە کوڕی قراری گۆ، کوڕی قراری گۆتی بابە هەر ئەو کو قایلە لەگەری دەگونجێم.

دەرێ کە هاتەوە ئەو خەبەری داوە کیژەی، کیژەکە دری بڕۆکەك مورتاح بوو، گۆتی خوا کەریمە هەتا ئەو چل رۆژە تەواو دەبی بزانین وەزعەکە چی لێدێ. ئەوجا لێرە لێی گەڕێین، با بچینە بن دنیایێ، بنی بیرێ، دەرێ کوڕەکە کە تەماشای کرد ئەوانە بەردەکەیان بەسەر دادا و غەربە، غەرب، نەما و دەنگە، دەنگ نەما رۆیشتن، زانی دەستی بەربوو، کێ دەری دەینی، گۆتی: نەء با هەر بەو کونەی دا بڕۆم بەگێی ئەو ژنەی بکەم، بریا هەر بە گێی ژنەکەم بکردایە، بەگێی خۆم نەکردبایە، دەرێ بە کونەکەیدا رۆیی کونەکە لە هەندە جێیان تەسك دەبوو لە هەندە جێیان دەبووە قوڕا و قوڕ و چرپا و رۆیی دەرێ هەر رۆیی ملی لێنا هەتا گەیشتە سەر بەحرەکەی، گەیشتە سەر بەحرەکەی تەماشای کرد بەحرەکی شین، پان، درێژ نە سەری دیارە نە بنی رۆیشت، مێرگەکی لێیە بوارە، گۆتی: با ئەمن سەرەکی بگەڕێم بزانم ئەو جوجکە و ئەو مریشکە- ئەگەر دیتمەوە مەعنای وایە قسەی ئەو ژنەی راستە چی بەمن گۆ، قسەکانی وی راستە دەرێ گەڕا و سوڕا مریشکەکە و جوجکەکانی دیتەوە کە مریشکەکە لە زیویە، جوجکەکانیش لە زێڕیە، روحیان لەبەرە هەرستا هەندەك شوڕوموری بڕی لەو دارانەی کە لەوێندەرێ هەبوون لەو دەو بەحرەی قەفەزەکی لۆ کردن، مریشکەکە و جوجکەکانی لەناو قەفەزێ کرد، لە قاتەکەش گەڕا قاتەکەشی دیتەوە، کە قاتەکەی دیتەوە تەماشای کرد کو شتەکی کەپس دەیکەی عەینەن کەپس بوو. دوورمانی تێدانەبوو وەکی کەپس بوو. ئەوە کیژەکە ئەو نەسیحەتەی کردبوو کە

ئەو دوو شتە لەسەر ئەو بەحرەی هەنە، ئەوجا تاقیبی ڕۆژی سێشەمی کرد. تەماشای کرد کە بەرانەکان هاتن تێریان گیا خوارد، تێریان ئاو خواردەوە، دەستیان بە شەڕە قۆچانێ کرد. دەرێ خینیان لە دەوی لە کەپوویان دەهاتە خوارێ وازیان لێك نەینا هەتا هەردووکیان پەکیان کەت لەلایەك قەفەزی مریشکی بەدەستەوەیە قاتیش لە باغەرێیە قۆرتەکی لێدابوو لە دەو بەحرەکەی کە بەرانە سپییەکە دەهاتە کنی دەهات خۆی باوێتە سەری نەدەخێوایێ. خۆی مات دەکردەوە. جارێك دوو جار، سێ جار بەرانە سپییەکەی لە پێش ڕەت بوو خۆی هەردا. کەتە سەر پشتی بەرانە ڕەشەکەی، بەرانی ڕەش برندی کرد ڕاست بردییە بن عەردی، لەوێ تەماشای کرد. باغاتێکی گەلەك گەورەیە باغاتێکی خۆش هەموو دار، هەموو مێوەجاتی، خوا نەبی قەت کەس دیار نییە، گۆتی: یا ڕەبی خودایە ئەوە دەبی چ مەملەکەتەك بی ئێرە دەبی ئاوەدانی هەبی، نەبی، بەس دەبی هەر ئاوەدانی هەبێت ساحێبی ئەو باغاتە بەلاش خۆ ئەو غاباتەی لێرە نەکردییە دەرێ زۆر عاجز بوو. پاری داوە. خەوی لێکەت، تەسادف ئەو ڕۆژەی ئاوابوو کیژی قەراری گاوری ئەو شارەی وێندەرێ لەگەر دەستە خوشکەکانی هاتبوونە سەیرانێ، هاتبوونە ناو ئەو باغ و باغاتەی بابیان، کە بگەڕێن لۆ خۆیان تەماشاکەن، بزانن ئەو باغانە چی تێدایە چی تێدانییە، تێنییان بوو گاسی کارەکەرەکەی خۆی کرد گۆتی: وەرە بڕۆ ئەو شەربەی لە فران کانی پڕ ئاوکە لۆمان بینە تێنیمانە ئاوی دەخۆینەوە، دەرێ کارەکەرەکە شەربەکەی هینا سوتفە ئەو کابرایە لە نێزیك کانیەکە بوو، خەوی لێکەتبوو، هات تووشی ئەو بەشەرەی بوو، تەماشای کرد بەشەرەك نووستییە کوڕەکی گەنج قۆز لاوەکی جوان، دەرێ لە دیاری دانیشت هەر تەماشای کرد، ئاوی لەبیر نەما، کاتەك لە بیری هاتەوە کە لۆ ئاوی هاتیە زۆر تاخیر بوو گۆتی: وەڵڵا بچمەوە کیژی پاشای خودا عالمە جوونم پێ دەداتن ئەمن زۆر تاخیر بووم، شەربەکەی پڕ ئاو کرد و بەغار ڕۆیی گەیشتەوە کنیان، کیژی پاشای گۆتی: ئەوە لۆ وا تاخیر بووی چت دەکرد لەوێ، گۆتی: وەڵڵایی چت لێ بشارمەوە ئەوە تاخیر بووم. گۆتی: وەرە پێم برێ، چت کرد لەوێ، گۆتی وەڵڵایی زەلامێك لەکن



کانیەکەی خەوی لێکەتییە، نووستییە، زەلامی ئەوا نە بکەی نە بخۆی تەماشای ئەو زەلامەی بکەی بەشەرەکی ئەوەندە جوان و ڕێکە هەر تەماشای ئەو زەلامەم دەکرد بەخەبەر نەهات، گۆتی: دەوەرە بچین پێم نیشان بدە بەدزی ئەوانە با ئەوانە ئاگایان لێ نەبیتن دەرێ پێکەوە هاتن هەتا گەیشتنە کن کابرای، کابرا هێشتا بەخەبەر نەهاتبوو خەوی لێکەتبوو گۆتییە کارەکەرەکەی ئەتوو بڕۆ دەنگێ مەکە، سەبر سەبرە گەر چوونەوەش لۆ لای مارێ ئەمن دوایێ دێمەوە نەرێی بەجێما لەوێندەرێ، گۆتی باشە. دەرێ لەکنی دانیشت تەماشای کوڕەکەی کرد گۆتی: باشە، ئەگەر ئەو کابرایە بەخەبەر نەهات لۆیە گاسی کوڕەکەی کرد کوڕە تەماشای کرد کیژەکی جوان و ڕێك و پێك قۆز ئەو هەموو زێڕەی بە قەلبی وەیە لە کنی دانیشتبوو. گۆتی: ئەتوو چی، گۆتی: وەڵڵایی ئەمن کیژی قەراریمە، کیژی پاشایمە، گۆتی: لۆ هاتییە ئێرانە، گۆتی: ڕێم کەتیتە ئێرانە خەبەریان لۆ هینام ئەوە لە دیارەتوو دانیشتیمە هەتا ئەتوو بەخەبەر دێی ئەوە بەخەبەریشم هینای ئەوجا هیچ حەفت و هەشتێ مەکە بەبێ لام و جیم- هەستە با بڕۆین، گۆتی: ئاخر ئەمن ئی سەر دونیاییمە، کەس ناناسم نەشارەزا نازانم کێندەر کێندەرێیە، بچینە کێندەرێ، گۆتی: با بڕۆین، دەرێ پیرەژنۆکەك خانویۆکەکی لۆ خۆی کردبوو لەوێندەرێ وەکی کوخی بوو، گۆتی: با بچینە کن ئەو پیرەژنەی، ئەو پیرەژنە جێیەکمان لۆ دەکاتەوە یان خۆمان لەوێ عەشار دەین هەتا سبەینێ، سبەینێ بزانین خوا چمان لێدەکا، دەرێ هاتنە کن پیرەژنەکەی هەندەك پارەو مارەی دا پیرەژنەکەی، پیرەژنەکەی ئیخفال کرد شەوێ لەوێندەر مانەوە لەکن پیرەژنێ، سبیانێ دەستی یەکیان گرت بڕۆن لۆ لایەکی زۆر ڕۆیشتن ماندی بوون دارەکی برندیان کەتە پێشی دارەکە زۆر گەورە بوو بە عومربوو، گۆتی: با لەبەر سێبەری ئەو دارە دانیشین لۆ خۆمان بڕەکی ئیسراحەت بکەین پشیمان بێتەوە بەرێ ئەوجا دەڕۆین، لەبن دارەکەی دانیشتن کاتەکێ کابرا سەری برند کرد تەماشای کرد مارەك وا بە دارەکەی هەر دەگەڕێ مارەکی گەل گەورە و بێ ڕەزا بوو، سێ فەرخە سیمرخ لەناو هێلانەکە بوو هەولێ فەرخەکانی دەدا بچی بیانخواتن گۆتی: وڵڵایی ئەو

مارەی دەکوژم، ئەو مارە دەچی ئەو فەرخە سیمرخانە دەخوا گوناحن. بە دارەکەی هەرگەڕا کەتە سەر مارەکەی مارەکەی شەت و پەت کرد، مارەکەی کوشت، وەکی مارەکەی کوشت پشك پشکی کرد و تێیهەردا پێش فەرخەکان، دەرێ فەرخەکان دەستیان بە خواردنی مارەکەی کرد، داکیشیان چووە لە چیای کەرتە شاخێك بینی بەسەر ئەو مارەی دا بەریبداتەوە مارەکەی بکوژی، فەرخەکان ئاقربوون جیکەجیکیان کرد لەناوخۆ گۆتیان: باشە ئەوە داکمان چووە کەرتە شاخەك دەینی داخوە شاخەکی چەند گەورە دەینی بەسەر ئەو دوو بەشەرەی دا بەرداتەوە هەردووکیان دەکوژی ئەمە چبکەین باشە، هەریەکەمان روو لەلایەك بکەین داکمان لە هەر لایەکی بەدیارکەت فڕە، فڕ و زیڕەزیڕ بکەین مەعنای ماینە داکمان شاخەکەی فڕێ دەداتن ئەوجا دێتەوە، دەرێ هەرسێکیان ئەو ئیتیفاقەیان کرد لەناو خۆیان ڕێککەتن، فەرخەکان بەس گاسی کابرایان کرد گۆتیان: ئەتوو چی، گۆتی: ئەمن بەشەرم گۆتیان ئێستا داکمان، دێتەوە کنەمە، سوئال دەکا- کێ ئەو چاکەی لەگەرە من کردیە بخوازی ماری دونیایێ ئەنگۆ هەر دەبینی چتان دەوێ بە داکمان برێ لۆتان دەکا، گۆتی: باشە، دەرێ ئەوان روویان هەریەکێ لەلایەکێ دەکرد ئینتیزاری داکیان دەکرد کاتەك دیتیان دایکیان لەوێ کەرتە شاخەکەی فڕێدا هاتەوە سەر هێلانەی نیشت هیلاك بوو پشی هاتەوە، ماندی حەساوە تماشای کرد ژنەك و پیاوەك لەبن دارەکەی دانیشتینە، گۆتی: کێ ئەو چاکەی لەگەرە من کردییە ئەو مارەی کوشتییە دایتیە فەرخەکانی من بخوازن ماری دونیایێ هەتا چتان دەوێ لۆتان بکەم، دەرێ کابرا گۆتی: وەڵڵایی ئەمن ئی سەر دونیایێمە سەر دونیاشم دەوێ، گۆتی: وەڵڵایی ئەمن حەفت سارە هێلانەم لێرە کردیە هەموو سارێ ئەو مارە دێ فەرخەکانم دەخوا بریا حەفت ساری دیکەش فەرخەکانی بخواردبوومایە بەس ئەو قسەت نەکردبایە. ئەویش گۆتی: لۆ، گۆتی: ئەختیار بوومە تاقەتم نەمایە، ئەنگۆش دوو نەفەرن گرانن بتانبەمە سەر دونیایێ بەس مادام ئەو چاکەتان لەگەرە من کردییە فەرخەکانی منتان نەجاتدا لەدەست ئەو مارەی چارە نییە دەبی هەر بتان گەینمە سەر دونیایێ، ئەوجا بە کابرای گۆ سبەینێ



رۆژ هەرات نان و ئاو و خواردن حازرکەن وەرنەوە بن ئەو دارەی دێمە خوارێ دەڕۆین بەتەمای خوای، گۆتی: باشە، دەرێ کابرا بە کیژەکەی پاشای گۆ ئەمن چ شارەزاییم نییە چ جی پێ نازانم بازاڕ لەکێیە شار لەکێیە، گۆتی: وەرە دەچینەوە کن پیرەژنێ هەندەك پارەو پولی پێ دەدەین و پیرەژنی رەوانە دەکەین نان و ئەرزاقەکەمان لۆ بکڕێتن و لەکن پیرەژنی دەبین و هەتا سبەینێ دەرێ هاتنەوە کن پیرەژنی، بە پیرەژنیان گۆت، پیرەژن گۆتی: تاقەتم نییە و ناگەمێ و بەپێیان ناتوان بڕۆم و نازانم چی و، دەرێ هەندەك پارەیان دایە پیرەژنێ پیرەژن لە خۆشی پارەکەی ئیقناع بوو چیان ویست پیرەژن چوو لۆی هینان، خۆیان حازرکرد و شەوێ لەوێ مانەوە سبیانێ لەگەر رۆژهەڵاتێ هاتنەوە بن دارەکەی راوەستان، دەرێ سیمرخ کە چاوی بەوان کەت هاتەوە خوارێ گۆتی: بەخۆ کەتینە کاملن تەواون گۆتیان: بەرێ، نان و ئاوی منیشتان هینایە، گۆتیان کاملمان هینایە، زیادمان هینایە کەممان نەهینایە، گۆتی: باشە، ئەمن هەرچەندە جاری گۆتم ئاو دەبی تێر ئاو بخۆمەوە، ئەوجا ئاو بەش دەکا بەش ناکە کەیفی خۆتانە وەکی گۆتم، نان، دەبی سێ نانم بەیەك جێی لەناو دەوێ نێن، ئەوجا بزانە چەند جار دەعوا دەکەم چەند جاری تێنیم دەبی تەخمینی ئەوەی بکەن دەنا سوار نەبن دەکەوین، گۆتیان: باشە، هەرئەوەی ئەتوو دەعوات کرد ئەمە حازرین دەرێ نان و ئاوەکەیان لەسەر پشت قایم کرد وەکی تەیارەی وەکی کۆپتەری ئەوانیش لەسەر یەك و بار سواربوون و لاقی خۆیان لە بنڕا توند بەستاوە لەبەرئەوەی هەتا بشپەڕن بەرنەبنەوە سەریان شۆڕدەبنەوە، دەرێ سیمرخ هەستا لەجێی خۆی برند بوو ماوەکی زۆر برند بوو گۆتی: عاردتتان لێ دیارە گۆتیان، بەرێ دیارە، دەرێ ئەوجارە برندبوو عەرد لەپێش چاویان گچکۆکە بۆوە، ئەوجارە گۆتی: عەرد دیارە، گۆتیان بەرێ. وەکو سەرسێرەکی دیارە عەرد، هەر ئەوها چاومان لێ حوکم دەکاتن، دەرێ ماوەکی برندبوو، گۆتی: عەرددتان لێ دیارە گۆتیان: نەخێر بزربوو هیچ تارمایی نەما، گۆتی: خۆتان بگرە، مارتان لەکێیە ئەنگۆ لە چ مەملەکەتەکینە، لەکێندەرێنە لەکێندەرێ نینە ئاخر بتانبەمە کێندەری وەنییە دەبی بزانی ماریان لەکێیە، دەرێ

کابرا گۆتی: بابە برێین وەکو شاری هەولێرێ، گۆتی: ئەمن مارم لە هەولێرێیە و لە فران جێیە بەس بمانگەییێتە ئاقاری هەولێری برێ ئەوە هەولێرە دەرێ باشە، دەرێ هەرچەند جارێ دەعوای ئاوێی دەکرد دەویان پڕ ئاو دەکرد، دەعوای نانی دەکرد سێ نانیان لە دەوی دەپەستا وەیلێهات نە نان ما نە ئاو، گۆتی: ئاو هیچ نەبوو گۆتی: کابرا بەژنەکەی گۆ، ئەوجا خۆت حازرکە لۆ بەربوونەوەی ئەوە ئاو نەما، گۆتی: نان نانیش نەما، گۆتی: نەء یەکجاری بوو ئەلحان وشەمان دێ لۆ عەردی، دەرێ هیچ چاری نەما، گۆتی: ئاو، ئاو نییە، رۆیشت گۆتی: نان، گۆتی: وەڵڵاییی چار نییە، با لاقی خۆم ببڕم لە دەوی نێم، دەرێ شیرەکەی لە ملی کردەوە لە نەرمەی رانی خۆی گیرکرد پارچە گۆشتەکەی لە رانی خۆی کردەوە لە دەوی نا، لەناو دەوی سیمرخی نا دەرێن گۆشتی بەشەری شیرینە کە لە دەویان نا، سیمرخ هەستی کرد کە ئەو گۆشتە بەشەرییە دەرێن شیرینە قوتی نەدا لەبن زمانی خۆی نا، زۆری نەمابوو برێین گەیشتە ئاقاری هەولێری نیشت بەسەلامەتی هاتنە خوارێ کابرا ئیسلام، بەس ژنەکە ئیسلام نەبوو گۆتی: ئەوجا وەرە ئەتوو شادە لۆ محەمەد مستەفا بینە، دەرێ ژنە شادەی هینا و ئیسلام بوو، گۆتی: لەبەرئەوەی ئێرە مەنتیقەی ئیسلامە، دەرێ ئەوجا گۆتیانە سیمرخی بڕۆ لۆ خۆت ئەتوو ئەوجا خودا حافیزت بی، بەخێرچی، ئەویش گۆتی: وەڵڵاییی ئەمن باڵدارم دەگەمەوە جێی خۆم بەس ئەنگۆ هەستن بڕۆن، هەتا لە پێش چاوم بزر دەبن، ئەوجا ئەمن دەڕۆم، مەخسەدی سیمرخ لێروکانە ئەوەبوو، کە هەردووکیان بڕۆن بزانی کیهانیان دەشەلی ئەو گۆشتە هی ئەوییە دەرێ کە خواحافیزیان کرد لە سیمرخی رۆیشتن، کابرا دەستی بە شەلین کرد دەشەلی لاقی دەشێلا گاسی کرد وەرە بگەڕێوە ئەتوو، گۆتییە ژنەکەش ئەتوو سەبر، سەبر، لۆ خۆت بڕۆ، دەرێ کابرا گەڕاوە، گۆتی: باشە وەکی نان و ئاو نەما ئەتوو لۆ لە رانی خۆت کردەوە لەناو دەوی منت نا گۆتی: وەڵڵاییی ترسام گۆتم نەبادا پەکی بکەوی لە برسان، بەربینەوە هەرسێکمان بمرین ئەمن لەو ترسەی گۆشتم لە رانی خۆم کردەوە، گۆتی: کیهان لاقتە، گۆتی: ئەو لاقەمە، گۆتی: گۆشتەکە لەبن زمانم وەکی چرێژ و



سیکۆتینی لێهاتیە، وەرە لێیکەوە و لە جێی خۆی بدە و پێوە دەنووسێتەوە بیپێچە و خواحافیزت بی، دەرێ گۆشتی لاقەکەی داوە و پینەی کردەوە و لاقی خۆی بەستاوە و سیمرخ دوعابوونی خواست و گەڕایەوە، ئەویش هات لەگەر ژنەکەی، شاری خۆیتی دەزانی ماریان لەکێیە و خانیان لەکێیە و برایەکانیان لەکێیە، گۆتی: ئەمن با لێرە جارێ واز لە برایەکانم بینم با بچینە فران جێ لەوێ لۆ خۆمان خانیەکی بەکرێ بگرین، بزانین وەزع کوە، تێبگەم ئایا بزانم برایەکانم لەگەر ئەو ژنانەی لەناو بیرێ هاتینە دەرێ چیان بەسەرهات مانیە، نەمانیە، دەرێ هەر گەڕا و سوڕا ئەرێ کەس نییە لێرە خانیەکی بەکرێ بدا سوئالی لەو و لەو کرد ئەرێ کەس نییە خانیەکی بەکرێ بدا گۆتیان: وەڵڵا بابە ئەو پیرەژنە هەیە خانیەکی بەکرێ دەدا بەس لێرە نییە نیوڕانان دێتەوە دەرێ نیوڕانێ تاقیبی پیرەژنیان کرد. پیرەژن هاتەوە چوونە کن پیرەژنی پاڕانەوە، پیرەژن گۆتی: وەڵڵاییی ئەمن بە تەنیامە لەو خانیەی ئەو خانیە لەمن زیادیشە دوو سێ غورفەیە وەرن لەگەر من لۆ خۆتان لە غورفەکی دانیشن گۆتیان: وەڵڵاییی لەوە باشتر نابی، خانیەکەیان لە پیرەژنیان گرت بەکرێ، یەك دوو رۆژی پێچوو ئەو کابرایە تەماشای کرد ئەو پیرەژنە سبەینان دەڕوا نیوڕانێ دێتەوە، نیوڕانێ دەڕوا ئێوارێ دێتەوە، دەرێ پرسیاری لێکرد و گۆتی: داپیرە گۆتی: ها. گۆتی: ئەتوو ئیش و کارت چییە، گۆتی: ئەمن بوویمە خزمەتکاری ژنەکی لەناو بیرێیان دەرهینایە گۆتی: لەکێندەرێ، گۆتی: لەناو بیرێ، گۆتی: کوو لەناو بیریان دەرهینایە تێبگەین، گۆتی: وەڵڵاییی ئەوە دوو برا بوون سێ ژنیان لەناو بیرەکی دەرهینابوو، بەشەڕهاتبوون لەسەر ژنەکان، قراریش زەلامی نارد هەردووکیان هینان ژنەکی لێستاندن یەك و ژنی دا وان و بەڕێی کردن و ژنەکەی لە کوڕی خۆی مارە کردییە ئەوە ئەمن خزمەتکاری ئەو ژنەمە، گۆتی: ئەتوو دەچییە کن ئەو کیژەی، گۆتی: بەرێ دەچمە کن ئەو کیژەی، گۆتی: داپیرە بە قوربانت دەبم چی برێی دەتدەمێ، پارە دەرێی، زێڕ دەرێی بەس ئەو ئەنگوستیلەت دەدەمێ بە ژنەکەی پیشان بدە، گۆتی: ئەوە موشکیلەی لۆ من دەبینیەوە، ئەمن دەوێرم توخنی ئەو کیژەی

بکەوم، لێم دەدا، جونم پێ دەداتن، دوایێ دەرم دەکاتن، گۆتی: نەخێر نە جونت پێدەدا نە لێت دەدا، نە دەریشت دەکا، بەس ئەنگوستیلەکەی پێ نیشاندە ئەگەر قسەی لەگەر کردی خەبەرەکەم لۆ بینەوە ئەگەر قسەشی نەکرد هەر خەبەرەکەم لۆ بینەوە برێ هیچی نەگۆت، دەرێ پیرەژن لە تەماحی زێڕی چاوی بە زێڕی کەت ئەنگوستیلەکەی لە دەستی خۆی کرد، دەرێ سبیانێ چوو رۆیی لۆ مارێ پاشای چووە کن کیژەکەی چ پێویستی کیژەکەی هەبوو جێبەجێی کرد، دانیشت لەکن ژنەکەی دەستیان بە قسان کرد، کیژەکە سەیری کرد ئەو ئەنگوستیلەیەی لە دەستی پیرەژنەکەیە چەند رۆژە لە دەستی نەبوو ئەورۆ لۆ ئەو ئەنگوستیلەی لە دەستیتی، گۆتی: داپیرە ئەو ئەنگوستیلەم نادەیێ تەماشایکەم، گۆتی: با، دەرێ ئەنگوستیلەکەی دایێ تەماشای کرد ئەنگوستیلەکەی ناسیەوە، گۆتی: داپیرە سوئالێکت لێ دەکەم بەس راستم پێ برێ، گۆتی: فەرموو گۆتی: ساحێبی ئەو ئەنگوستیلەیەت دیتییە ئەتوو، گۆتی: ئەرێ وەڵڵا وا لە مارێ مەیە، گۆتی: هەر لە مارێنگۆ، لە مارێنگۆ، گۆتی: ئەرێ وەڵڵا لە مارێ مە مەعلوم، گۆتی: زۆر، زۆر سەلامی لێ بکە لە ئەحوالیشی دەپرسم، ئەمنیش ئەوە مایمە وا لێروکانەمە ئەوجا تەگبیرەکی لۆ وی دەکەم، عیلاجی وی دەکەم، گۆتی: باشە، دەرێ نێوەڕانی پیرەژنەکە هاتەوە بەخێرهاتنیان کردەوە، چووە کن پیرەژنێ گۆتی: ها داپیرە چت کرد، گۆتی: رۆرە بەخۆی تەماشای ئەنگوستیلەکەی کرد، ئەمنیش گۆتم، ساحێبی ئەنگوستیلەکەی وا لە مارێ مەیە. گۆتی: چی گۆ گۆتی: زۆر باشە، پێی برێ، ئەمنیش وا مایمە ساغ و سەلامەتم، دەرێ کیژەکە فکری کرد گۆتی: وەڵڵایی ئەنگوستیلە هەیە پێك دەچی بەشکو ئەو ئەنگوستیلەیە هەونییە، ئەمن ئەو دوو نیشانەی لەکنیتی ئەگەر ئەو نیشانەیە بێتەجێ مەعنای وایە هەوە تەواو، ئەگەر ئەو دوو نیشانەش نەبی مەعنای وەیە هەونییە، دەرێ نیوەڕانێ پیرەژن هاتە کنی گۆتی: فەرموو چ ئیشەکت هەیە برێ- تێنیتە، برسیتە، چایەت دەوێ، ئاوت دەوێ هەرچت دەوێ ئەوە راوەستامە لۆت بینم، گۆتی: ناوەڵڵا هیچم ناوێ وەرە بە کوڕی قراری برێ



تووشی سەر ئێشەکی بوویمە، دالغەم هەیە سەرم زۆر دێشی سەرم چانابی، ئەگەر ئەو ساحێبی زێڕینگرەکانە، زێڕینگرەکان گاس بکاتن مریشکەکم لۆ بکاتن لە زیوی جوجکەکانیشی لە زێڕی ئەمیش بۆ خۆم بەریان دەدەمە ناو ئەو چار باغەی تەماشایان دەکەم بەلکە ئەو سەریەشەم لە کۆرم دەبیتەوە، گۆتی: باشە بەسەرچاوان، دەرێ پیرەژن لێیدا رۆیی چووە کن کوڕەکەی قراری گاوری، ها گۆتی: داپیرە خێرە، گۆتی: وەڵڵایی ئەو کیژە سوئالەکی ئەوهای پێ گۆتیمە منیش هاتیمە بەتوو برێم، گۆتی: فەرموو، گۆتی: پێی برێ دەبێ سبیانی نا دووزبەی، سێیەی بەسێ رۆژی دی مریشکەکەم لۆ بینی زیو بی جوجکەکانیش زێربی، ئەمن لەناو ئەو چار باغەی خۆم بەرەڵڵایان دەکەم، تەماشایان دەکەم پێیان دەخافرێم بەشکو ئەو سەریەشانەش لەکۆرە من دەبیتەوە، گوتی: بەسەرچاو، خەبەری بدێ ئینشاڵڵا سێیەمین رۆژ لەکنی عازرە، دەرێ خەبەری لۆ هیناوە لۆ کیژەکەی گۆتی: ئینشاڵڵا بە سێ رۆژی دی لۆی دروست دەکەم، دەرێ کوڕەکەش چوو بە بابی گۆ، گۆتی: بابە، گۆتی: ها، گۆتی: دەبی مریشکەکەم لۆ بکرِی لە زیوی بی، جوجکەکانیشی لە زێڕی بیتن لەناو چار باغەکەی بەرەڵڵای دەکەم کە ئەو ژنە تەماشای بکاتن تووشی نەخۆشی بووە تووشی دالْغە بووە، بەلْکو لەسەری دەڕوا، بابیشی هەندبێ ئاقر بوو نەیگۆ کوڕم کو مریشك لە زیوی کو دەکرێ، جوجکە لە زێڕی کو دەکرێ ئاخر کو دەڕوا ئەوە دروستیشیان کرد، گۆتی: ئەمن دەمەوێ نازانم وەڵڵا دەرێ بابێ بانگەوازی راهەند لەناو شاری گۆتی: ئەوەی زێڕینگرە سبەینێکە لە فرانکە جێ خڕدەبیتەوە ئیشم پێیانە، دەرێ زێڕینگر هەموو خڕبوونەوە، مشەوەش بوون، کابراش لە ماری خۆی شۆڕبۆوە لۆ ناو بازاڕی ئەو جێیەی کە زێڕینگرەکان لێی خڕبوونەوە، دەرێ پاشا قسەی کرد و گۆتی: سبیانێ مریشکەکم دەوێ لە زیوی جوجکەکان لە زێڕی بڕۆن بجولێنەوە- قرتە قرتێ بکەن بنیشن، بفڕن، دروستی دەکەن، دروستی بکەن، دروستی ناکەن ئەوەی زێڕینگربی لەسەری دەدەم دەرێ زێڕینگر گۆتیان: باشە بەسەرچاو پاشا دروستی دەکەین، دەرێ زێڕینگر زێڕیان هینا خوارێ زیویان هینا خوارێ دوکانیان بەتارکرد، مریشکیان

دەکرد، مریشك نارِوا، جوجکەیان دەکرد جوجکە نارِوا روحی نایەتە بەرێ، دەرێ کابراش چووە کن زێڕینگرەکی گەلە گەورە گۆتی: کاکە سوئالەکت لێ بکەم، گۆتی: فەرموو، گۆتی ئەنگۆ لۆ وەها مشەوەش بوونە، گۆتی: وەڵڵا بابە بەرێی خۆتدا برۆ، نە سوئالم لێ بکە نە جوابیشت دەدەمەوە ئەتوو چی گۆتی: وەڵڵایی ئاخر سوئال کردن خراپ نییە ئەمن نەشارەزامە ئێ گۆتی: ئەتوو چت پێ دەکرێ وەڵڵایی ئاخر پێم برێ لۆ وەدەکەن ئەنگۆ گۆتی: بابم پاشا ئەمری لەسەر کردینە مریشکەك لە زیوی جوجکەی لە زێڕی، روحیان لەبەری، بڕوات، بجولێتەوە، قرتەقرتی بکاتن، بنیشن، بفڕن، ئەمە ئەو هەموو زێڕ و زیوەمان تێکدا دروستی دەکەین نارِوا، گۆتی: باشە، ئەمن لۆتان دروست بکەم چەندم دەدەنێ، گۆتی: لێیدەن ئەوە شێتە ئاخر شێتە ئەوە بەمە دروست ناکرێ ئەتوو کوی دروست دەکەی، گۆتی: ئەوە مەعمەلەیە ئەگەر دروستم کرد، گۆتی: بابە ئەگەر ئەتوو دروستت کرد وەرە ناو دوکانەکەی من دانیشە ئەمن خواحافیزم هەرچی ئەتوو دەرێی ئەمە دەتدەینێ، گۆتی: باشە دەرێ کابرا هاتەوە لە مارێ پاری داوە و سبیانێ جوجکە و مریشکەکەی لەناو قەفەزەکەی ناو پەرۆکەکی پێدادا و راست لۆ بازاڕی هاتە خوارێ، دەرێ وەکی چوو زێڕینگر هەموو دوکانیان کردبۆوە- هەرا- تێکسوڕانە، مشەوەش دەرێ چووە کن کابرای گۆتی: سەلام وعەلێك، گۆتی: عەلێکم و سەلام خۆی تێنەگەیاند دەرێ راوەستا لەبەر دوکانەکەی گۆتی: چت دەوێ کاکە گۆتی: ئەدی دونێ ئەمن و توو مەعمەلەمان نەکردبییە، گۆتی: مەعمەلەی چی، گۆتی: مەعمەلەی مریشك و جوجکەکان، کوڕە گۆتی، ئەتوو شێتی خوا لێی شێواندی، گۆتی: ئەدی بابە ئەمن و توو مەعمەلەمان نەکرد ئەمن لۆت بکەم، ئەمن ئەو شەو دروستم کردییە، گۆتی: کانی گۆتی ئەوەتە، دەرێ پەرۆی لەسەر قەفەزی هەرداوە دیتی مریشکەکە لە زیوی دروستکرایە و جوجکەکانیش لە زێڕی دروستکرایە و جولە جولیتیان حەرەکەیە جیوە، جیوە کابرای زێڕینگر دەرێ لە خۆشیان وەخت بوو سەکتەی قەلبی بگری، کوڕە گۆتی: وەرن زێڕینگر غاریاندا برۆ لۆ لای مارێ پاشای گەیشتنە پێش دەرکەی مارێ پاشا دەرکەوان هاتنە پێشیان کوڕە



ئەنگۆ چنە چتان دەوێ گۆتیان کاکە ئەمە دەچینە کن پاشای ئاخر لۆ دەچن گۆتی: خەبەری بدێ ئەوە مریشکمان هینایە لەگەر جوجکەکان ئەو ئەمرەی کە پاشا دونێ کردبووی ئەمرەکەمان بەجێگەیاند دەرێ خەبەریدا پاشا گۆتی: با بێت، دەرێ کابرای زێڕینگر مریشك و جوجکەکانی بردە کن پاشای بەرەڵلای کرد عەینەن مریشك لە زیوی جوجکەکان لە زێڕی دروست کرابوو، گۆتی: ئەشهەدومابیلا، زێڕینگری چاکم هەیە هەدیەکی دایێ و بایداوە دەرێ هاتنەوە کن دوکانێ کابرای، کابرا لەوێ بوو گۆتی: کاکە ئەوجا چ شەرمێ مەکە چەندی بەخۆت حیسابی دەزانی برێ هەتا بتدەینێ دەنا لەبەرتوو نەبایە ئەمە هەموو ئیعدام بووین، دەرێ مەبلەغە پارەکی زۆریان دایێ رۆیی پارەکەی برد چۆوە مارێ، کوڕەکەی قراری گاوری گاسی پیرەژنی کرد گۆتی: وەرە ئەوە مریشکەکە ئەوە جوجکەکان لە بۆ خانمێ ببە دەرێ پیرەژن هەر تەماشای کرد وەڵڵایی ئەوە مریشك و جوجکەکانە زیندینە، دەرێ لۆ کیژەکەی برد کیژەکە تەماشای کرد بەریدانە ناو چارباغی دەستیان بە جیکەجیکی کرد گۆتی: وەڵڵایی زێڕینگری گەلەك سەگبابن، ئەگەر دروستیان کردبی بەس ئەو جارە ئەمن حیسابی قاتەکەی لەگەر دەکەم قاتەکە دروست ناکرێ چونکە ئەوانە ئەگەر نەبڕن یان نەدورن کەپس نابی پێیان ناکرێ دەرێ دوو سێ رۆژی دیکەی پێچوو کیژەکە هەر خەریکی جوجکە مریشکەکان بوو گاسی پیرەژنەکەی کرد گۆتی: وەرە داپیرە برۆ بە کوڕی قراری برێ نەخۆشیەکەم تۆزەك لەسەر خەفیف بووە بەرەو چاکبوون دەرۆم بەس ئەو شەو خەونەکم دیتیە دەبی خەونەکەم لۆ جێبەجێ بکات دەرێ چییە خەونەکە دەرێ ئەو شەو قاتەکم لەبەرکردبوو نەدوورابوو نە هەریش بڕابوو قاتەکە کەپس بوو، پێی برێ قاتەکەم لۆ دروستکا دوورمان و مورمان وهەربڕینی نەبی دەرێ باشە، ئەو خەبەرەی لۆ کوڕی قراری گاوری هینا، ئەوە ئەو کیژە دەرێ نەخۆشیەکەم خەفیف بووە و بەرەو چاکبوون دەچم بەس لە خەوێدا خەونم دیت قاتەکەم لەبەربوو قاتەکە نەدوورابوو نە هەریش بڕابوو وەکو کەپس بوو دەبی قاتەکی ئەوهام لۆ دروست بکا و بینی ئەمن لە کنە خۆم بەدارێ وەدەکەم، گۆتی: باشە، دەرێ ئەویش چووە کن بابی

داوای له بابی کرد، گۆتی: بابه، گۆتی: بەرێ، گۆتی: دەسگیرانم داوای قاتەکی لێ کردیمه نه هەربڕابی نه دووراش بی ئەوجا خەیاتەکانی خۆت گاسکه لەو شارەی هەر دەرێی ئەمن خەیاتم هەیه خەیاتی زۆر چاکم هەیه، گۆتی: باشه، دەرێ بانگی راهێشت له شاری گۆتی: سبیانێ ئەوەی خەیاته دێ له فرانجێ خڕدەبیتەوە ئیشم پێیانه، دەرێ خەیات سبیانێ خڕبوونەوە بووە مشەوەش، کابراش لەلای مارێ خۆیان شۆڕبووەوە لۆ بازاڕی دەرێ چووە ناو قەرەبارغییەکەی، خەیات مقەسیان لەبەر باغەری خۆیان راکردیه و دەرزیان لەبەر یەخەی خۆیان راکردیه ئەوە عەلاماتی خەیاتییه، گۆتی: خەیاتەکانی من، ئەنگۆ خەیاتی زۆر چاکن خەیاتی زۆر بەناوبانگن هەتا سێ رۆژی دی دەمەوێ قاتەکم لۆ دروست بکەن ئەو قاته نه به مەقەسی بڕابی نه به مەکینەش دوورابی دەرێ خەیات مشەوەش بوون هەموو تەماشای یەکیان کرد، ئاخر نه به مەقەسی بڕی نه به مەکینەی بدوری قات کو دروست دەبی لەو گۆڕەی، نەشوێران برێن ناکرێ، گۆتیان: بەسەرچاو پاشا، بڕۆن گۆتی: خواحافیزتان به سێ رۆژی دیکه دروستی نەکەن لەسەرتان دەدەم، دەرێ خەیات پەرتەیان لێکرد و هاتنەوە و هەر کەسه و چۆوە دوکانی خۆی، دەرێ ئەویش شۆڕبۆوە له دوایان هاته ناو کۆرانێ خەیاتان، تۆپه قوماشی دەهێننه خوارێ، ئێ نەیبڕی نابته شەروار نابته کورتەك، ئێ تەگبیر دەرێ ئەو هەموو تۆپەیان دڕاندبوو مشەوەش دەرێ ئەویش له تەنیش خەیاتەکی راوەستا گۆتی: ئەرێ کاکه ئەنگۆ لۆ وەها مشەوەش بوونه، گۆتی: بڕۆ بابه بڕۆ ئەتوو ئیشی خۆت بکه کاکی خۆم بڕۆ عەمباری بکه ئیشەکی بکه عانەکی پەیدا بکه باشتره لۆ مار ومندارت، جا گۆتی: خۆ کاکه چ قسەکی خراپم نەکردییه دەرێم لۆ وەها مشەوەش بوونه، ئێ گۆتیان ئەتوو چی چت پێ دەکرێ، گۆتی: وەڵڵا بەلکا شتەکم پێ دەکرێ، گۆتی: بابم ئەوە پاشا لەسەری کردینه قاتەکی لۆ دروست بکەین نەدوورابی نه هەریش بڕابی کەپس بیتن ئەمەش ئەو هەموو قوماشانەمان هەموو بڕی و هەمووومان فڕێدا و هەموو خەساربوو پێمان دروست نابێ، گۆتی: باشه کاکه ئەمن لۆم دروست کردن چمان دەدەیێ چم دەدەنێ گۆتی: بیگرن لێیدەن ئەو سەگبابه شێته



خەیات دەورەیان لێدا، دەرێ خەیات دەورەیان لێدا گۆتیان راوەسته کاکه بەڵکو کابرا دەتوانی دروست بکاتن ئەنگۆ حەجەلەی لێ مەکەن، گۆتیان بابه کو دروست دەکەن گۆتی: چ ئیشتان هەیه ئەنگۆ بەڵکو ئەوشۆ لۆتان دروست دەکەم، گۆتیان بابه ئەگەر ئەتوو ئەو قاتەت دروست کرد چی دەرێی ئەمە دەتدەینێ، هەر به کەیفی خۆت چ دەرێی برێ گۆتی: باشه دەرێ هاتەوە مارێ، ئێوارێ قاتەکەی هینا خوارێ هینایه دەرێ دایوەشاند گۆتی: نەبادا تۆزی گرتبی لەناو پەڕۆکەکی لولدا لولیدا سبەینێ که شۆڕبۆوە لۆ ناو کۆرانی خەیاتان دەرێ چووە کن دوکانەکەی راوەستا سەلامی له خەیاتەکەی کرد بەخێرهاتنی کرد گۆتی: کاکه لۆ راوەستای گۆتی: ئەی دونێ مەعمەلەمان لەگەر توو نەکرد که قاتەکەت لۆ دروست بکەم گۆتی: ئەتوو کابرایەکەی دونێی، گۆتی: بەرێ، دروستت کرد، گۆتی: بەرێ ئەوەته دروستم کرد، دەرێ خەیاتەکان له خۆشیان خەنی بوون، به هەرەداوان قاتەکەیان برد دایانه پاشای، پاشاش به کوڕەکەیدا و دەرێ، کوڕەش قاتەکەی لۆ برد پیرەژن دەرێ بردی که کیژەکه تەماشای قاتەکەی کرد که نەدورایه و نه هەربڕایه موتلەقەن ئەو کابرایه لەناو شاریه یەعنی مەوجوده قەیدی حەیات مایه ئەو کابرایه لەکن ئەو ژنەی که لەبن عەردی هینای کیژی قەراری گاوری هێشتا نەیگۆتیه ئەمن حار و حیکایەتەکەی ئەوهام لێقەومایه ئەوهام بەسەرهاتییه ئەو ژنه لەوێ حاسێبووە پێی نەگۆ، گۆتی: نەبادا ئەوە ئیداره نەکا، یان برێ لۆ ئەمنت دەینا مادام ژنت هەبوو ئەتوو بەتەمای ئەو ژنەی بووی ئەتوو لۆ وەت کرد دەرێ ئێوارێ دانیشت کابرا زۆر خۆی عاجز کرد ژنەکەش پێی گۆت: فران ئەوڕۆ لۆ وەها عاجزی قسەکی ناکەی گۆتی: وەڵڵایی چت لێ بشارمەوە ئەمن عار و حکایەت و بەسەرهاتی من زۆر دووره، ژنەکەی تێگەیاند که چی بەسەرهاتییه، لەسەر ئەو ژنەی ئەویش گۆتی: چ قەیدی دەکا خۆ ژن ژنی نەخواردییه مادام ئەتوو لەسەر ئەو ژنەی ئەوهات بەسەرهاتییه، ئەگەر پێت دێتەوە بیهینەوە، گۆتی: وەڵڵایی ئەو ژنه لەجێیەکی حاسێیه ئەگەر عیلاجەکی لێ نەکەین ئەتووش ئاقری و دەزانی و تەگبیرەکی لۆ بکه، گۆتی: دەچینه کن ئەو پیرەژنەی به

پارە بێ، بە زێڕبێ بە هەرچییەك بێ ئەو پیرەژنەی ئیخفال دەکەین بە تەماح سبیانەکەی لەگەری بڕۆ پیرەژنەکە نیو سەعات شمەکی کیژەی لەبەر بکە لەجێی وی دانیشیت، ئەویش جلکەکانی پیرەژن لەبەر بکا لە ماریێ پاشای بێتە خواریێ، وەکی هاتە خواریێ هاتە دەرێ راست لەگەرە خۆت بیهینەوە ماریێ، گۆتی: وەڵڵایی تەگبیرەکی چاکە، دەرێ ئێواریێ هەردووکیان چوونە کن پیرەژنێ پاڕانەوە، گۆتیان: داپیرە گۆتی: ها. گۆتی: دەزانی ئەمە لۆ هاتینە، گۆتی: فەرموو گۆتی: هاتینە چی دەرێی پارە دەرێی، دەتدەینێ زێڕ دەرێی دەتدەینێ ئەوەندە پێت حیساب دەکرێ لۆ خۆت نیو سەعاتان سبیانێ شمەکەکانی خۆت بدە ئەو کیژەی ئەتووش شمەکی ئەو لەبەر بکە و لە ماریێ کیژەی دانیشە، با کیژەکە شمەکەکانی توو لەبەربکە لە ماریێ پاشان بێتە خواریێ نیو سەعات دەبیبینین با بێتەوە کنە توو وەکی هاتە کنە توو شمەکەکانی بدەوە هەر کەسە و لەجێی خۆمان خەلاس و بڕاوە دەی چەندەم دەدەنێ چەندەم نادەنێ، گۆتی: بابە تەنەکەکت دەوێ ربکەت دەوێ چت دەوێ دەتدەینێ گۆتی: ربە لیرەکم بدەنێ گۆتیان: باشە دەرێ ربە لیرەکیاندا پیرەژنێ پیرەژنیان ئیخفال کرد سبەینێ کوڕەکە لەگەر پیرەژنی لێیاندا هاتن، هاتنە کن ماریێ پاشای دەرێ کوڕەکە لۆ خۆی خۆی خافراند پیرەژنیش چوو بە کیژەکەی گۆت: حار و حیکایەتەکی ئەوهایە گۆتی: ئەرێ وەڵڵا بە قوربانیشت دەبین دەرێ شمەکەکانیان گۆڕییەوە کیژە شمەکی پیرەژنەکەی لەبەرکرد، هاتە خواریێ لە ماریێ پاشای و ئەویش شمەکی کیژەکەی لەبەرکرد و لۆ خۆی لەسەر کورسی خۆی دانیشت دەرێ هاتە خواریێ لەگەر کابرای یەکدیان ناسیەوە، تەکسی و مەکسی نەبوو برێن سواری تەکسی بن هەرێن، گۆتیان: ئەوجا با بەخێرایی بڕۆین لۆخۆمان، خۆمان نەجات بدەین، مەجالەکە ئەوەندە نییە نیو سەعاتە هەتا دەگەینە مارێنگۆ دەرێ بەخێرایی هاتن گەیشتنە ماری کابرای گاسی ژنەی کرد گۆتی: وەرە ئەوجا تەگبیر چییە ئەوە ئەمن ژنەکەم هینا گۆتی: ئەوجا با خۆمان خڕکەینەوە برین ئەنوکە قراری گاوری پیرەژنی لەگەرە خۆی دەینتەوە ماریێ، ئەلێروکانە بمانبینی هەرسێکمان ئیعدام دەکا، دەرێ لێیاندا لۆ خۆیان



بەخێرایی رۆیشتن ماوەکی گەلە زۆر رۆیشتن دەرچوون لە ئاقاری چوونە دەرێ تووشی شارەکی بوون پارەیان زۆر بوو، زێڕیان زۆر بوو، گۆتیان ئەوجا با لۆخۆمان لێرە لەجێیەکی با ساتر بین هەتا عەردەکی دەکڕین پەیدا دەکەین لۆخۆمان دەکەینە خانی، لێی دادەنیشین، هەتا ماینە، دەرێ جێیەکیان لۆ خۆ گرت بە ئیجار دانیشتن، عاردەکیان لۆ خۆیان کڕی و عەمەلە و وەستایان هینا و کردیانە بینایەکی گەلەك خۆش برند سێ، چار قات لێی دانیشتن لۆ خۆیان هەسێکیان، دەرێ ماوەك مانەوە لەوێندەرێ حەیاتەکی خۆشیان رابوارد، رۆژەك دەرۆزەکەرەك سوتفە هات لە دەرکەیدا رۆژ هەندەی نەمابوو، رۆژ لەسەر زەردەی بوو، دەرێ ژنەکە هات دەرکەی لێکردەوە گۆتی: چت دەوێ، گۆتی: وەڵڵایی فەقیرم دەرۆزەی دەکەم ئەوەی خوا بە قیسمەتی کردبێ، بمدەنێ، گۆتی: ئەدی بەو شەوەی خارە دەچییە کێندەرێ گۆتی: وەڵڵایی بچمە کێندەرێ ناگەمە چ جێیان کەسیش ناناسم لەو شارەی گۆتی: وەرە لە راهی خوای داتدەکەین لێروکانە هەتا سبەینێ لۆ خۆت لێروکانە بە سبەینێش خوا حافیزت بێ، گۆتی: وەڵڵایی مەمنونتان دەبم زۆر باشە، دەرێ دەرکەی لێکردەوە کابرا لەگەری چووە ماریێ لەجێیەکی دانا لە غورفەکی ئێواریێ نان و مانیان داییێ دەرێ کابرا هاتەوە ماریێ خۆی کوڕەکە گۆتی: ئەو زەلامە کێیە لەوێندەر دانیشتییە، گۆتی: وەڵڵایی ئەوە دەرۆزەکەرە میوانە ئەوشۆکە لێروکانە دەبی سبەینێ خواحافیزی بێتن دەرێ، ئەویش چووە کنی بەخێرهاتنی بکاتن تەماشای کرد برایەکی خۆیەتی ئەهۆ و هۆ کە پێك شادبوونەوە ئەحوالی برایەکەی تری پرسی گۆتی: کەوتیتە کێ. ئەویش وەرامی داوە، گۆتی: هەر لە جێگای خۆیەتی ئەوجا چوون بە دوایا ئەویشیان هینا لای خۆیان و هەسێکیان جێنشین بوون لەگەر یەك هەروەك پێشان.

------------------------------------

* لەسەر زاری مەحمود خدر محەمەد تۆمارکراوە.
* لە گۆڤاری ئاسۆی فۆلکلۆر ژمارە ٥ تەمووزی ٢٠٠١ بڵاوکراوەتەوە.

# کابرایەکی پووش فرۆش

هەبوو نەبوو کەس لە خودا گەورەتر نەبوو، کەس لە درۆزن رووڕەشتر نەبوو، دەگێڕنەوە ژنەك و پیاوەك هەبوو، کوڕەك و کیژەکیان هەبوو، کابرا ئیشی پووش فرۆشتن بوو، هەموو رۆژەك دەچووە دەشتێ چەند قۆمەتەکی پووشی خڕدەکردەوە و هەندەکی دەهێناوە و لە بازاڕ دەیفرۆشت و ئەوی دیکەشی لۆ سبەینێ دەهێشتەوە. حەیامەکی بەو حارەی بەسەربرد، دەرێن رۆژەکی وەکی دەچتە لای قۆمەتە پووشەکە دەبینی هێلکەکی لەسەر کرایە بەران چ هێلکە گەلەك جوان دەبی، کابرا هێلکەی لەگەر خۆی دەهێنتەوە بەو و بەوی نیشان دەدا. خەرکەکە سەریان سوڕدەمینێ لە جوانی ئەو هێلکەیە و لەگەر ئەوەش نازانن لە قیمەتی و هەروەها هێلکەی چییە، ئەو خەبەرە براو دەبیتەوە هەتا خەبەر دەگاتە پاشای شار، لۆیێ پاشا لەدوو کابرای دەنێری، کابرای پووش فرۆشیش بەخۆی و بە هێلکەکەوە دەچتە لای پاشا. کە پاشا چاوی بە هێلکەکە دەکەوی دەزانی ئەوە هێلکە دوڕە، لۆیێ بە پارەکی باش لێی دەکڕی و لەگەر ئەوەش پێی دەرێ هەر هێلکەی وات بەدەست کەت لۆم بینە لێت دەکڕم، دەرێن هەموو رۆژێ لەسەر قومەتە پووشەکە هێلکەك دەکرا و کابراش دەیهیناوە و دەیدایە پاشا و پاشا پارەکی باشی دەدایێ، بەو جۆرە کابرای پووش فرۆش زۆر دەورەمەند دەبی، دەبتە ساحێب دیوەخان و خزمەتکار، هەر بە ئاغا- ئاغا گاسیان دەکرد، بەو حارە چەند سارەکی پێ دەچی، کابرای پووش فرۆش دەرێ مەمنونی ئەو خوایەم کە ئاوڕێکی بەخێری لێ دایمەوە ئەو هەموو مارەی پێ



بەخشیوم کەواتە حەجیشم کەتیتە سەر خۆم و مار و مندارم، پووش فرۆش کشت و مشت دەکڕی و لۆ خۆی و ژنەکەی و کوڕەکەی و کیژەکەش لەلای خزمەتکارەکە بەجێ دێلی و ئەوان دەکەونە رێ لێیاندا رۆیشتن چەند رۆژەکی پێ دەچی، خزمەتکارەکە نیەتی خراپی بە مێشکی دادێ و دەرێتە کیژەی شتەکی وام لەگەر بکە، کیژەش ساحێب شەرەف و ناموس دەبی دەرێ شتی وا ناکەم، خزمەتکار چەند لێی دەپاڕێتەوە، دەیترسێنێ بێ سوود دەبێ، کارەکەی سەرناگری، کە دەگاتە نێزیك گەڕانەوەی حەجاجان، خزمەتکارەکە دەرێتە کیژەی بەپیری باب و داکت و براتەوە دەچم کیژەکەش دەرێ باشە. خزمەتکار دەڕوا لەرێێ تووشیان دەبی و یەکسەر خزمەتکارەکە دەرێتە بابی کیژەی لەو رۆژەی ئەنگۆ رۆیشتینە کیژەکەت دەیگۆتە من دەبی ئیشەکی وام لەگەر بکەی منیش لەگەرم نەکرد، لۆیێ هاتووم پێت برێم، بابی گەلەکی پێ ناخۆش دەبی. لۆیێ بە کوڕەکەی دەرێ، کوڕم ئەتو برۆ بیبە لۆ دەشتێ و بیکوژە و لەبن عەردی رابکە و شمەکە بەخینەکەشم لۆ بهینەوە چونکە نابی ئەمن بیبینم، دەرێن کوڕە دێتەوە مارێ و خوشکەکەی بەخێرهاتنەکی گەرمی دەکا، لە پاشان کوڕە بەفێر خوشکەکەی سواری ماینێك دەکا لە پشتەخۆی و سەیەکەشیان بەدوایان دەچی، براکەی بەسەرهاتەکەی لۆ خوشکەکەی دەگێڕێتەوە، خوشکەکەش سوێند دەخوا کە ئەو داوای شتی وای کردیە، ئەو لەگەری نەکردیە، براکەی پێی باوەڕ دەکا، لۆیێ دەرێ خوشکم لەجیاتی توو ئەو سەیەی دەکوژم و شمەکی توو بەخین دەکەم و لۆ بابم دەبەمەوە ئەتووش برۆ لۆ ناو ئەو کونە شاخە بەشکم رێبوارێك دێ و لەگەری برۆ چبکەم چارم نییە و بابە ئەمری داوە، کوڕە سەیەکەی دەکوژی و شمەکی خوشکەکەی بە خینی سەیەکەی بەخین دەکا و نانەکی زۆریشی لۆ بەجێ دێلی و شمەکە بەخینەکە لۆ بابی دەهینتەوە، کیژەش دەچتە ناو کونە شاخەکە. لۆ رۆژی دوایی، کوڕە ئاغایەك لە راو دەگەڕا، بەوێ دادێ.

کوڕە ئاغا لە دوورەوە بۆراییەك دەبینی، کیژەش کە رێبوارەکان دەبینی لەبەرئەوەی رووتە دەچتە ناو کونە شاخەکە، کوڕە ئاغا زەینی لێ دەبی لۆیێ نێزیك دەبتەوە،

تووڵەی بەردەداتە ناو کونە شاخەکە. بەران تووڵەکە دەچێتە ناو کونە شاخ و بە قۆڕەقۆڕ دێتەوە دەرێ، کوڕە ئاغا دەرێ ئەوە شتەك هەیە دیارە بە تووڵەی نایەتە دەرێ وا باشە قانگی بدەین، کیژە گێی لەو قسەیە دەبێ، هاوار دەکا و دەرێ نا قانگم مەدەن، من کیژەکی رووتم شەرم دەکەم بێمە دەرێ برۆن شمەکی ژنانم لۆ بینن دێمە دەرێ، کوڕە ئەمر دەکا بچن شمەکی لۆ بینن. چەند خزمەتکارەك دەچنەوە مارێ و شمەکی لۆ دەینن و لۆی فڕێ دەدەنە ژۆرێ، کیژە شمەکەکان لەبەر دەکا و دێتە دەرێ، کیژ چ کیژ نە بکەی نە بخۆی هەر تەماشای ئەو کیژەی بکەی ئەوەندە جوان، کە کوڕە پاشا چاوی پێ دەکەوێ یەکسەر ئەشقی دەبی کوڕە ئاغا راوی بەتار دەکا و کیژەی دەباتەوە مارێ و کیژە بەسەرهاتی خۆی دەگێڕێتەوە و کوڕە پاشا دەرێتە بابی لۆم مارە بکە. پاشا کیژەی مارە دەکا و چەند سارەکی پێ دەچی، سێ کوڕی دەبی، پاش حەیامەکی کیژە بە پیاوەکەی دەرێ حەز دەکەم سەرەکی لە ماری بابم بدەم زۆر غەریبییان دەکەم بزانم چییان بەسەر هاتیە، کوڕە پاشا دەرێ باشە. دوو ماینی دەڕازێنێتەوە یەك لۆ ژنە و ئەوی دیکەش لۆ خزمەتکارەکی، ژنە دوو منداری لەگەر خۆی سوار دەکا و یەك لە پێشی خۆی و ئەوی دیکە لە پشتە خۆی و خزمەتکارەکەش کوڕەکی لە پشتە خۆی سوار دەکا و بەڕێ دەکەون لۆ ماری بابی کیژەی، ماوەیەکی دەڕۆن دری پیس دەبی و دەرێتە ژنەی شتەکی وام لەگەر نەکەی ئەو منداڕەی لەکنمە سەری دەبڕم، ژنە دەرێ سەری ببڕە ئەمن شتی وا ناکەم خزمەتکار کوڕەی سەر دەبڕی، ماوەکی دیکە دەڕوا دیسان دەرێ ئەگەر شتەکی وام لەگەر نەکەی کوڕەکی دیکەت سەردەبڕم، ژنە دەرێ شتی وا ناکەم سەری ببڕە. بەو جۆرە هەتا هەرسێ کوڕی سەردەبڕی، ئەوجا دەرێ ئەتوو دەکوژم، ژنە دەرێ باشە ئەمن دەچمە ئەو کەندێیێ خۆم حازر دەکەم لێرە نەوەك رێبوارەك بێرەدا بێ، خزمەتکار دەرێ باشە، ژنە دەڕوا راست لەوێ هەردێ، خزمەتکار چەند لەدوای دەڕوا نایگاتێ، ناچار دەبی بگەڕێتەوە کە دەگەڕێتەوە دەرێتە کوڕە پاشای ژنەکەت رۆیی و گۆتی ناگەڕێمەوە، ژنەش کە دەگاتە نێزیك شاری مێگەلە حەیوانەکی دەبینی لادەداتە کن شوانە و دەرێ مام شوان شوانی کێی شوانەش دەرێ شوانی فران ئاغام، بابی کیژەی دەردەچی، ژنە



دەرێ مام شوان لۆ نابێ جلکمان بگۆڕینەوە ئەو هەموو زێڕەی پێوەمە و ماینەکەشم دەتدەمێ، شوانە دەرێ کیژم لۆ گەمەم پێ دەکەی ئەمنی ردێن سپی دە عومری تووم تێدایە، کیژە سوند دەخوا بەڕاستیتی، شوانە بڕوای دێ و جلکان دەگۆڕنەوە، کیژە دەرێ مام شوان رۆژانە ئەتوو چ دەکەی لەوێ هەمووم لۆ بگێڕەوە شوانە رۆژ بە رۆژ چ دەکا لۆی دەگێڕێتەوە کیژە فێردەبی. ئەوجا دەرێ مام شوان ئەتوو بڕۆ بەران نەیەوە ئەو شارەی. شوانە دەرێ باشە، لێدەدا دەڕوا، کیژە ئێوارە دەگەڕێتەوە وەکی شوان هەموو ئیشەکانی خۆی دەکا بێ ئەوەی هەستی پێ بکەن. کوڕە پاشای ئەولای دەرێ دیارە قسەی خزمەتکارەکە راستە، لۆیێ خزمەتکارەکە لەگەرە خۆی دەبا. بەرەو ماری بابی ژنەی دەکەونە رێ. مارێ بابی ژنە دەبیننەوە و خزمەتێکی باشیان دەکەن بێ ئەوەی بیانناسن شەو لە دیوەخان دادەنیشن و کیژەش لەلای پێراوان لە دیوەخان دادەنیشێ و مێردەکەی خۆی دەناسی بەران دەنگی ناکا. شەوێ درەنگ یەکێك لە مەجلیسەکە دەرێ هەقایەتەك، بەسەرهاتەك کەس نیە لۆمان بگێڕێتەوە، مەجلیسەکەمان لۆ خۆش بکا، ژنە واتە شوانە گۆتی:

ئەمن هەقایەتەکی گەلەك خۆش دەزانم بەران بەشەرت دەرێم، پێش ئەوەی هەرکەسەکی ئیشەکی لۆ دەرێ هەیە با بچی و بگەڕێتەوە چونکە ئەمن دەرکەی کلیل دەدەم لە کاتی گێڕانەوە نابی کەس بچێتە دەرێ. مەجلیسەکە سەریان سوڕما لەو شەرتەی، کەسیش تێنەگەیشت لەو شەرتە لۆیێ گۆتیان باشە، شوانە دەرکەی کلیل دا و بەسەرهاتی خۆی بە کاملی گێڕایەوە و لەیەك ئاشکرابوون بە درەکی خۆش، هەردوو خزمەتکارەکانیشیان لەوێ کوشت، منیش کراشم دڕا و چم پێ نەبڕا.

---

تێبینی: ئەم هەقایەتەم لە خوشکی جوانەمەرگم (زبێدە ئیسماعیل) بیستووە.

* لە گۆڤاری نووسەری نوێ ژمارە ٥ خولی دوای راپەڕین ئەیلوولی ١٩٩٨ بڵاوکراوەتەوە.

## نسیب

کابرایەك هەبوو ناوی (خواناس) بوو، بابەکی هەبوو عومری (٦٤) سار بوو ناوی (رەحمان) بوو، دەستی زۆر کورت و فەقیر بوو، هیچ خۆشییەکی لە دنیا نەدیتبوو، رۆژەك لە رۆژان کوڕەکەی پێی گۆت: بابە ئەمنیش وەکو تووا پیر بووم، ئەتو کەینێ ژنەکی لە بۆ من دەینی، بابی پێی گۆت: کوڕم وا بە خۆت باش دەزانی هیچمان نییە، بە چ ژنت لۆ بینم؟

ماوەکی زۆری پێ چوو بابی کوڕە، یانی مام رەحمان نەخۆش کەت، نەخۆشییەکی زۆر، زۆر نەخۆش، فکری لە قەلبی خۆی کردەوە زۆر نەخۆشە و زۆر زگی بە کوڕەکەی سوتا، گاسی کوڕەکەی کرد: وەرە کوڕم وەسیەتت لۆ دەکەم. کوڕەکە گۆتی: فەرموو بابە، گۆتی: کوڕم دونیا بوو ئەگەر ئەمن مردم ئەتو دەزانی چم لۆ دەکەی؟ گۆتی: بابە ئینشائەڵڵا قەت نامری، چونکە بە تەنیا دەمینیێمەوە، گۆتی: کوڕم گێ بگرە، وەکی مردم هەموو رۆژێ سێ نان ببەستەو بڕۆ فڕێی دە ناو ئەو زێییە، ئەویش نەیگۆت لۆ بابە، گۆتی: باشە، بابە شەرت بی وەکی مردی هەموو رۆژێ سێ نانی ببەستم و بچم فڕێی دەمە ناو ئەو زێییە.

پاشی ماوەکی بابی کوڕەکە (مام رەحمان) ئەمری خودای کرد، کوڕەکە هاواری عالەمەکەی کردو گۆتی: وەرن بمگەنێ بابم ئەمری خوای کرد، عالەمەکە خڕبوونەوە و رۆیشتن لۆ سەر قەبران، دەستیان بە قەبرلێدان کرد، قەبرەکەیان تەواو کرد، مام رەحمانیان کفن کردو هەریانگرت لۆ سەر قەبران، لەوێندەرێ هاویشتیانە ناو قەبرەکە



و خۆریان بەسەرداداو تەقەتیان کرد، لەسەر قەبران گەڕانەوە ماری و چوونە مزگەفتێ تازیەیان دانا. کە تازییە خەڵاس بوو (خواناس) هاتەوە ماریێ، مارەکی چۆل و حۆل، دانیشت لۆخۆی زۆر زۆر گریا هەتاکو مەرەقەکەی لە در چووە دەرێ، دانیشت بە عادزی. یەك لە جیرانەکانی چووە لای، سەلامی لێ کرد و لەلای دانیشت، دەستی بە قسان کرد و دری (خواناس)ی داوە، قسەی زۆر خۆشی لۆ کردو گۆتی: خواناس! کوڕم داك و باب هەتا سەر لۆ کەس نامینێ، خەم مەخۆ گەردەنی بابت ئازاکەو زۆری لەگەر ماندی بووی، پیاوەکی گەلەك باش بوو. خواناس گۆتی: گەردەنی بابم و هی بابیشی ئازادبی، بەس مام عەلی بابم وەسیەتەکی لۆ کردیمە.. مام عەلی گۆتی: فەرموو برێ، وەسیەتەکەی بابت چییە؟ گۆتی: وەڵڵاهی بابم پێی گۆتیمە هەموو رۆژێ سێ نانان ببەستەو بڕۆ فڕێیدە ناو ئەو زێییە، مام عەلی گۆتی: کوڕم لەوە ئاسانتر هەیە؟! وەسیەتەکەی بە جێ بینە و دری عاجز مەکە.

سبیانێ هەستا سێ نانەکەی لە یەك بەستاو چوو فڕێی دایە ناو زێییەکە و تەماشای نانەکەی کرد ماسی دەوریان لە نانەکەی داو نانەکە بزر بوو .. رۆژەك ئەوها دوو رۆژ ئەوها مانگەك ئەوها، ماوەکی زۆری پێ چوو، رۆژەك گۆتی: باشە ئەمن ئەو نانەی فڕێ دەدەمە ئەو زێییە، لۆ نەیکەمە خێر لۆ بابم و نەیدەمە فەقیرەکی یان سەیەکی برسی، پاشان فکری کردەوە، گۆتی: نەخێر با بەیانیش بێم نانەکە بخەمە ناو زێییەکە، ئەمن مەلەوانەکی زۆر چاکم، وا چاکە لە دوو نانەکە خۆم باوێمە ناو زێییەکە بزانم نانەکە کێوە دەچی.

بەیانی نانەکەی هینا، جوانی بەستا و توند، خۆی رووت کردەوە و نانەکەی فڕێدا ناو ئاوەکە و لە دووی نانەکە خۆی فڕێ دا ناو ئاوەکە. نانەکە نقوم بوو، چووە دووی، دیتی دەستەکی زۆر سپی و جوان هات نانەکەی توند گرت و ئەویش دەستی برد و دەستەکەی توند گرت، دەستەکە هاتە قسەکردن و گۆتی: بەرم دە ئەوە توو لۆ دەستی منت گرت؟ گۆتی: وەڵڵاهی بەرتنادەم هەتاکو پێم نەرێی ئەتو چی، گۆتی: بەردە پێت دەرێم، گۆتی: نەخێر بەرتنادەم، گۆتی: کاکە ئەمن رسق و نسیبم، گۆتی: باشە دیارە

ئەتو دەزانی نسیبی من لە کێندەرێیە، گۆتی: بەرێ ئەمن دەزانم قسمەتت لە کێندەرێیە، گۆتی: دە پێم برێ، گۆتی: نسیبت لە فلان شارە، کیژەك حەفتەکە لە داك بووە، ئەوجا دەبی راوەستی هەتا ئەو کیژە گەورە دەبی و دەبیتە قسمەتت. ئەوجا خواناس گۆتی: یارەبی خودایە بە دانانی توو بە رسقی توو بە قسمەتی توو، دەستەکەی بەردا و دەستەکە رۆیی.

گەڕاوە مارێ و فکری لێ کردەوە، گۆتی: واچاکە بچمە ئەوشارەی، ئەو کیژەی سەرببڕم و بگەڕێمەوە با ئەو قسمەتەم نەمینێ. (خواناس)ی فەقیر و هەژار هیچی نەبوو. هەستا شەش- حەفت درهەمی قەرد کرد، شمەکەکی باشی خواست و ماینەکی لە گوند خواست و بەرگەکی باشی لەبەرکردو چەقوەکی زۆر زۆر تیژی لەبەرکی نا، بەرێ کەوت لۆ شارەکەی، برۆ باژۆ، برۆ باژۆ، هەتا گەیشتە شارەکە، گۆتی: خوایە ئەمن ئەو مارەی ناناسم، نازانم ماریان لە کێندەرێیە، ئەو مارەی کوو ببینمنەوە؟ گۆتیە ماینەکەی ئەتوو ماینەکی ئەسلی، ئێستا جەرەوەکەت بەر دەدەم، دەبی بچیە ئەومارەی. ماین رۆیی رۆیی، چووە پێش مارەکی راوەستا، ئەویش گاسی مارەکەی کرد، ئافرەتەك جوابی داوە گۆتی: فەرموو فەرموو ئەی مێوان، ئافرەتەکە هاتە دەرێ و جەرەوی وراغەکەی گرت. فەرمووی: دابەزە ئەی مێوانی بەڕێز، ئەویش لە وراغەکەی هاتە خوارێ، تەماشای کرد خانیەکی خراپ، دیوار هەموو روخاو، هەروەکی کەلاوەیە، مارەکی فەقیر و هەژار. ئافرەتەکە تەماشای کرد ئەم سوارە دەستوری ئەو شارەی نییە، قەت دەستووری وای نەدیتبوو، لە دری خۆی گۆتی: بەرێ ئەو پیاوچاکە بوویتە مێوانی ئێمە، با بچم بگەڕێم پیاوەکەم ببینمەوە و خەبەری بدەمێ. ئافرەتەکە لۆ دوای پیاوەکەی رۆیی. گەڕاو سووڕا هەتا پیاوەکەی دیتەوە، پێی گۆت: وەرە وەرە پیاوەکە، مێوانەکمان هاتیە، مێوانی ئەوهامان قەت نەبووە، پیاوەکە گۆتی: باشە ئافرەت خۆ ئەمە هیچمان نیە، ئەدی باشە چ لۆ ئەو میوانە بکەین؟ ئەویش گۆتی: ئەتوو وەرە خوا کەریم و رەحیمە. هاتن گەیشتنە مارێ، کابرا دیتی میوانەك دانیشتیە، قەت میوانی ئەوها نیە، فکری تێك چوو، گۆتی: خوایە



ئەم مێوانە چییە، ئەمن قەت مێوانی ئەوهام نەدیتیە، دەستو دەوی یەکتریان ماچ کردو دانیشتن، زۆر بەعاجزی قسەی لەگەر مێوانەکە دەکرد. مێوانەکە تەماشای کرد ئەوانە هیچیان نیە، دەستی کردە گیرفانی خۆی، دوو درهەمی دەرینا و گۆتی: پیاوەکە ها ئەوە لۆ ئێوارێ بە نان بدە. خاوەن مارەکە لە خۆشیان نەیزانی چ بکا، هەستا چووە بازاڕی نانی ئێوارێی هینا، ئێوارێ دانیشتن هەرسێکیان نانەکەیان خوارد، ساحێب مارەکە گۆتی: خوا کەریمە لۆ سبەینێ! مێوانیش لە دری خۆی گۆتی: بەیانی ئەمن لێرە نابیننەوە!

دانیشتن دەستیان بە قسان کرد، مێوان تەماشای کرد کیژە هەر دەگریێ، قەت کڕ بوونەوەی نییە، گۆتی: ئەو کیژە لۆ وەها دەگریێ؟ ساحێب مار گۆتی: وەڵڵاهی ئەوە لەوەتی خوا دایتیە مە کڕ بوونەوەی نییە، هەر دەگریێ. مێوان لە دری خۆی گۆتی: مەترسێ هەر ئەو شەوەی مایە لۆتانی سەردەبڕم ئیتر چی دیکە ناگریێ.

ئیتر شەو هات و نووستن، ئەوان تێر بوون، زوو خەویان لێ کەت. پاش نووستن، مێوان هەستا پارەکەی بەرکی خۆی کردە دوو بەش، بەشەکی لە بن سەری دانا و بەشەکەی دیکەی لە بن پێی دانا، چەقووەکەی لە بەرکی دەریناو کیژەی سەربڕی، بەبێ دەنگی ماینەکەی دەرهینا لێی سوار بوو، هاتە دەرێ، کەوتە رێ و گەڕاوە لۆ مارێ خۆی. ئەوان چەند شەو بوو نەنوستبوون، بەخەبەر نەهاتن هەتاکو بەیانی.

بەیانی کە بە خەبەرهاتن، تەماشایان کرد نە میوان لەجێی خۆی مایە و نە کیژەکەش دەگریێ. ئافرەتەکە گۆتی: پیاوەکە هەستە نە میوان مایە نە هیچ، کیژمان ناگریێ، دیارە مردییە وا جوولەی ناکا. کابرا راپەڕی، تەماشای کرد کیژە خەوەکی لێکەتیە، خەوی ئاوا ئەگەر لە بەهەشت هەبێ، کیژەکەیان هەرگرت تەماشایان کرد هەندە پارەی لە بن سەریە، وە هەندەکی دیکەی لە بن پێیانە، پیاوەکە گۆتی: ژنەکە ئەوە پیاو چاك بوو ئەمە نەماندەزانی، دەنا قەت نەماندەهێشت بڕوا. تەماشایان کرد کیژەکە خەتەکی سۆر سۆری شێوە خەناوکەیی کەتیتە ملی، گۆتیان: ماشەڵڵا خودایە! ئەو مێوانە چ میوانەك بووە؟

پیاوەکە هەستا بەو بڕە پارەیەی داینابوو لۆ خۆی معامەلەی پیێ کرد، سەبر سەبر لۆخۆیان ژیان، رۆژ رۆیی، مانگ رۆیی و سار رۆیی، ماوەکی زۆری پیێ چوو کیژەکە گەورە بوو گرانیەك کەتە ناوچەکەیان، هەموو لۆ ناوچەی دیکە باریان کرد. تەسادوفی کرد ئەو مارە هاتنە ئەو گوندەی کە (خواناس)ی لیێ بوو، ئەوانە هاتن لە بن دیواری مزگەفتیێ خستیان، رۆژی جومعە بوو (خواناس) دەهاتە مزگەفتیێ لۆ غودبە(خطبة)ی، کە چاوی بەو مارەی کەت کە لە بن دیواری مزگەفتیان خستیە، زۆر زگی پێیان سوتا، کە تەماشای مارەکەی کرد دیتی کیژەکیان لەگەرە، کیژەکە زۆر زۆر جوانە. (خواناس) فکرو عەقلی کەتە سەر ئەو کیژە، گۆتی: وەڵڵاهی وا باشە پاش نوێژی جومعەی هەندەك پیاو و حاجیان تێبگەینم لۆم بچنە داخوازی ئەو کیژەی. نوێژ خەلاس بوو، هاتنە دەریێ، خواناس هاتەوە ماریێ نانی لۆ نەخورا، فکری هەر لەسەر کیژەکەی بوو، هاتە لای چەند پیاوی ماقوول و حاجی و جوامێر، داوای لیێ کردن بچنە کن ئەو مارەی و داخوازی ئەو کیژەی لۆ بکەن. تاقمە پیاوەکی ڕێك رۆیشتن، چوونە مارەکە، داوایان کرد، بابی کیژەی بەبیێ ئەوەی قسەی بکا، گۆتی سەرچاوان کیژەی من پێشکەش ئەو بیێ. هەستان مەلایان هینا و کیژەکەیان لە (خواناس) مارەکرد. پاشان چەند جلوبەرگەکی لۆکردو کیژەکەی گواستەوە ماری خۆیان، ئێواریێ دانیشتن لەگەر بووکیێ نانیان خوارد، کابرا تەماشای کرد کیژە خەتەکی سۆر سۆری لە ملیە وەکی خەناوکەیە، پێی گۆت: ئەو خەتە سۆرە چیە لە ملت؟ گۆتی: نانەکەت بخۆ پێت دەرێم، گۆتی: نانی ناخۆم هەتا پێم نەرێی، گۆتی: وەڵڵاهی ئەمن مەلۆتکە بوویمە میوانەکمان هاتیە، شەو لە ماریمە مایە، هەتا بەیانی هەستاینە میوانەکە نەمایە و رۆییە و ئەم خەتە سۆرە لە ملی من پەیدا بووە. (خواناس) فکری کرد، گۆتی: بەریێ ئەمە نسیبەکەی خۆمە، بەیانی هەستا چوو داك و بابی کچەی هینایە کنە خۆی و بەسەرهاتی خۆی لۆیان گێڕایەوە و بەخێوی کردن وەکو داك و باب.

**منیش کراشم دڕا و هیچم پیێ نەبڕا.**



------------------------------------

* لە زاری مەحموود خدر تۆمارکراوە لە دایکبووی ١٩٥٠ لە هەولێر دادەنیشێت.
* لە گۆڤاری پەیامی راستی ژمارە ٧٧ پایزی ٢٠٠٦ بڵاوکراوەتەوە.

## هەنجیری چل تام

دەگێڕنەوە پیاوەکی جۆتیار هەبوو، شەوێك لە خەونیدا، سێ ڕۆژ هەردێ یەك لەسەر ملی ڕاست و ئەویتر لەسەر ملی چەپ و هی سێیەم لەسەر سەری کە ڕۆژ بۆوە، لەخەو هەستا بە ژنەکەی گۆت: چمان هەیە بخۆم ژنەکەش دەرێ: نانەك و کەرتەك، پیاوەکە نانە ساغەکە لە باغەری دەنێ و خەونەکەی لۆ ژنەکەی دەگێڕیتەوە، ئینجا دەرێ: بەدوای خەونەکەم دەڕۆم هەتا لەمەبەستەکەی، پێدەکەوم دەڕوا کە ئێوارەی بەسەردادێ نانەکە دەخوات و هەر لەدەشتایەکە لێی دەنووێ بەیانی لەخەو هەردەستێ و دوو ڕۆژی دیکە دەڕوا تا دەگاتە گوندێك، لە کابرایەك دەپرسێ ئەرێ ماری ئاغای لە کێیە، کابرا ماری ئاغای نیشان دەدات، دەچێتە دیوەخان نان دەخوات وئێوارە لەگەر دانیشتوانی دیوەخان دەکەونەگفتوگۆ، ئاغا لێی دەپرسی چ ئیشت هەیە، کابرا بەسەرهاتی خۆی لۆ ئاغا دەگێڕتەوە ئاغا بە خەونەکە سەرسوڕمان دەبێت، لۆیە دەرێ لۆ خەونەکەت بەمن نافرۆشی تۆ وەرە شوێنی من و منیش دێمە شوێنی تۆ، دوو ژنم هەیە دەستیان لێ بەردەدەم و مرك و ماریشم هەموو لۆ توو، کابرا بیری کردەوە لە دری خۆیا گۆتی:ئامانجی خەونەکەم هاتەدی ،دوو ژنەکە ئەوە ڕۆژی لای ملی ڕاست و چەپمە، مرك و مار و ئاغایەتیەکەش ئەوە ڕۆژی سەرسەرمە، قبوری کرد، کابرا دێتە شوێنی ئاغا، ئاغەش بەیانی لەخەو هەردەستێ و سواری ئەسپەکە دەبێ و سێ ڕۆژ دەڕوا،ئینجا دەگاتە گوندێك لە گوندەکە دەچێتە دیوەخان نان دەخوات، دواتر ئاغای گوندەکە لێی دەپرسی لە کێ هاتی و لۆ کێ دەچی چیت گەرەکە، کابرا بەسەرهاتی



خۆی لۆ دەگێڕتەوە، ئاغای گوند ناوی ئەحمەد دەبێ ئاغای کۆنیش ناوی موحەمەد دەبێ دوای دانیشتنەکی زۆر ئاغا بە موحەمد دەرێ: لۆ نایەی خەونەکەت بە من بفرۆشی من خاوەنی دوو ژنم و مرك و مارەکی زۆریشم هەیە تۆ وەرە شوێنی من، منیش دێمە شوێنی تۆ، موحەمەد ڕازی دەبێ، بەیانی ئەحمەد سواری ئەسپێك دەبێ و دەڕوا، سێ شەو و سێ ڕۆژ دوای ئەمە، کاتی مەغریب دەبێ لەدوورەوە گوندێك دەبینێ و دەچیتە لای گوندەکە دەبینی هەر چوار دەوری بە شورەیەکی برند گیراوە تەنها یەك دەرگای دەبێت ئەویش لۆ هاتوچۆ، کابرا دەرێ: باجارێ نەچم تا پاش ماوەیەکی دی، دەرێ کە تەواو مەغریب داهات دەرگاکەیان داخست، ئەحمەد دەچێتە لای دەرگاوانەکان دەرگاوان دەرێ بە ئەمری میر بەشەو دەرگا لەهیچ کەسێك ناکەینەوە ئەحمەد دەرێ ئەی باشە ئەم شەو لە کێ بنووم یەکێك لەدەرگاوانەکە دەرێ: لەم لا کەلاوەیەك هەیە ئەم شەو لەوێ بنوو بەیانی دەرگات لێ دەکەینەوە، ئەحمەد بەناچاری چووە نێو کەلاوەکە و ئاگرێکی کردەوە و لە نزیکی پاری داوە، بەڵام خەوی لێ نەکەوت، کیژی میری ئەو گوندەش ماوەی حەفت سار حەزی لە کوڕی وەزیر دەکرد بەڵام باوکی نەی دەدایە، لەم شەوەش کیژە بەڵێنی بە کوڕە دابوو لە سەعات ١٢ی شەو لەم کەلاوەیە بەیەك بگەن و بڕۆن، کوڕە وەزیریش ناوی ئەحمەد دەبێ شەو لە کاتی خۆی کیژە دێ و لەسەر دیوارەکەدا دەرێ: ئەحمەد، ئەحمەد، ئەحمەدیش وەڵامی دەداتەوە و کیژە دەرێ بڕۆ ئەسپەکە بینە ئەسپەکەی دەینی و کیژە میر لە پشتی سوار دەبێ و دەرێ بڕۆ، ئەحمەد دەرێ لۆ کێ، دەرێ بڕۆ، دەڕۆن تا بەرەبەیان، بێ ئەوەی چ قسەیەك بکەن دەگەنە سەر مێرگەك و ڕۆژ هەردێ و کچەمیر کە سەیری دەکات ئەحمەدی کوڕی وەزیر نییە، لێی دەپرسێ ناوت چییە دەرێ ناوم ئەحمەدە، کیژە میر گەرەك جوێن لۆ کوڕە وەزیر دەنێری و دواتر بەسەرهاتی خۆی لۆ ئەحمەد دەگێڕیتەوە، هەروا دەرێ تازە من مێرد بەتو دەکەم، ئەحمەد دەرێ: ئەگەر نادری دەتبەمەوە، کیژە دەرێ تازە نسیبی تووم، ماوەیەکی زۆر دەڕۆن دەگەنە دەشتاییەك کیژە دەرێ تێنیمە ئەحمەد کە سەیر دەکا مەتارەکەی ئاوی تێدا نەمایە، کیژە میر

دەرێ زۆر تێنیمە ئەحمەد دەرێ: لێرە دانیشە وا لەدوورەوە شینایەك دیارە دەچمە ئەوێ ئاوی دەینم، کیژە دەرێ: بڕۆ ئەحمەد دوو سەعات دەڕوا ئینجا دەگاتە سەر کانییەك دواتر چەند شتێکی جوان دەبینێ وەك زێر بریقەی دەدایەوە دوو سێ پارچەی هەرگرت و هاویشتییە ناوگیرفانی و گەڕایەوە لای کیژە میر کیژە تێر ئاو دەخوات دەکەونە رێ لەرێگا لەدوورەوە گوندێکی زۆر گەورە دەبینن، ئەحمەد دەرێتە کیژەی تۆ لێرە بە هەتا دەچم خانووەك پەیدا دەکەم و دەگەڕێمەوە دوات، کیژە رازی بوو، ئەحمەد دەچێتە گوندەکەو خانووەك بەکرێ دەگرێ و دەگڕێتەوە دوای کیژەکە، کیژە میر زۆر ئاقر دەبێ، دەرێتە ئەحمەد ناوم لەیاد نەکەی ناوم خاتوونە، بڕۆ هەندێ شتومەك بکڕە و بانگی مەلای گوند بکەو من لەخۆت مارە بکە، ئەحمەد داواکارییەکەی جێبەجێ دەکات، چەند ڕۆژەکی پێ دەچێ، خاتوون دەرێ: ئەحمەد لەم شتانەی هینایتە یەکێکی لەگەر خۆت بەرە لۆ میر و هەروا پێی برێ ئێمەش مارمان هینایتە ئێرە و چاوێکت لێمان بێت، ئەحمەد لەگەر دراوسێیەك دەچێتە لای میرو، میریش بەخێرهاتنێکی گەرم و گوڕی دەکات و دوای ماوەیەك دانیشتن شتەکەی بەمیر دەدات، دانیشتوانی ئەوێ سەرسوڕمان دەبن لەجوانی شتەکە میر بەم دیارییە گەلەك درخۆش دەبێت، ئەحمەدیش بەبەخێرهاتنی گەرم و گوڕی میر گەلەك درخۆش دەبێ، پاش زۆر دانیشتن ئەحمەد دەگەڕێتەوە ماری خۆی، دوای گەڕانەوەی ئەحمەد، میر بە وەزیرەکانی دەرێ، دەبێ ئەم شتەی لەکێ هێنابێ، وەزیری دەستە راست جولەکە دەبی ناوی /شقلوم/ دەبێ، وەزیری دەستەچەپ فەلەدەبی ناو /بقلوم/ دەبی، وەزیری دەستە ڕاست زۆر رقی لە خەرك بوو، حەزی دەکرد برسیبن، بمرن، بیانکوژی، بەڵام وەزیری دەستە چەپ حەزی لەفرت و فێر نەبوو، لەگەر خەرکەکە زۆر باش بوو، شقلوم دەرێتە میری هەبی و نەبی ئەو کابرایە لۆ ئەوە هاتووە بمانکوژی خۆی ببێ بەمیر، میر دەرێ: بقلوم تۆ دەرێ چی بقلوم دەرێی ئەو کابرایە وەزیراتی لێدێ، گەر بەقسەی من دەکەی لەشوێنی من دەیکەی بە وەزیر، چەند مانگێکی پێدەچێت رۆژەك کەچەرەك لەناو کۆران هێلکەی دەفرۆشت بە پێش دەرکەی ماری ئەحمەددا دەچێ، ژنەکەی دەبینی کەچەر بە غاردان



دەچێتە لای میر و بە میر دەرێ میرم خۆش بی، ژنی ئەحمەدم بینی هەر دەرێی گورە، توخوا تۆ ژنت هەیە، میر هەر لە وەسفی کوڕە کەچەر، ئەشقی ژنی ئەحمەد دەبی، بانگی شقلوم دەکات و بەسەرهاتەکەی لۆ دەگێرێتەوە، شقلوم دەرێ، پێویستە بیفەوتێنین میر دەرێ چار، شقلوم دەرێ ئاسانە، ئەو دوڕەی کە لۆ تۆی هێنابوو دەرێین چوار دوڕی دیکەی لێیە دەبێ لۆمان بهێنی گەر نەیهێنی لەسەرت دەدەین و ئینجا ئەم دوڕانەی پێنایە تیادەچی، جاری پێشوو بەختی هەبوو دەنا لەناو دەچوو چونکە ئەم شوێنە بەسەدان دێوی تێدایە، میر دەرێ تەگبیرەکی زۆر باشە لە دوای ئەحمەد دەنێرێ ئەحمەد دەچیتە دیوەخان، سەلام دەکات میر بەسەری لموزی وەڵامی دەداتەوە، جا ئەحمەد دەرێ: میرم خێربوو بەدوای منت ناردوە، میر دەرێ: ئەحمەد چواردوڕی دیکەم دەوێ گەرهێنات خەلاتەکی باشت دەکەم ئەحمەد بەم داواکارییە درتەنگ دەبێ: میر دەرێ ها ئەحمەد دەبینم درتەنگ بووی، دەیهینی باشە، نەیهینی لەسەرت دەدەم، ئەحمەد دەرێ باشە دەیهێنم، دەگەرێتەوە مارەوە توورەیی پێوە دیاردەبێت ژنەکەی دەرێ: خێرە ئەحمەد دەرێ ئەوەی بەقسەی ژنی بکات سەری لە قوڕێ رادەچێ گەر نەتگوتبایە ئەم دوڕە لۆ میر ببە لۆ داوای چوار دوڕی دیکەی دەکرد، ژنەکەی دەرێ ئەمە تورەیی لۆچییە دەبڕۆ لە جیاتی چواردەی دیکەی لۆ بینە، بەڵام ئێستا پێش ڕۆیشتن بڕۆ عەبدەکی باش بکڕە خەرك سەد زێریدا تۆ دووسەد زێری پێبدە هەروەها هەندەك کەل و پەل و خۆراکیش لۆ مارێ بکرە و بگەڕێوە، ئەحمەد دەچێ عەبدەکی زۆر گوێڕایەر و زیرەك و بەهێز دەکڕێ و لێی دەپرسی ناوت چییە عەبدەکە دەرێ ناوم مەحەمەدە، بەیەکەوە دەچن هەندەك کەل و پەل و خۆراك دەکڕن و دەگەڕێنەوە مارێ، دواتر ئەحمەد دەرێ موحەمەد کاریتەی خانووەکەمان شکایە بابچین کاریتەیەك بکڕین، بەیەکەوە چوون کاریتەیەکیان کڕی و ئەحمەد بە موحەمەدی گۆت/ئاگاداری/ کاریتەکەبە، دەچم کرێکارێك دەهێنم، موحەمەد دەرێ پێویست ناکە ئەم کاریتەسووکە باوەش لەکاریتە دەدات و دەیخاتە سەرشانی، ئەحمەد لۆی روون دەبێتەوە کە عەبدەکی زۆر باشە و بەهێزە، گەڕانەوە مارێ و نانی دەخۆن و ئینجا ئەحمەد دەرێ

موحەمەد لێرەبە دەچم کرێکارێك دەهێنم ئەم کاریتە بخاتە جێی شکایەکەی موحەمەد دەرێ: کرێکاری ناوێ یەکسەر دەچێ کاریتەکە دەردەهێنێ و کاریتەکەی دی لەشوێنی ئەو دادەنێ، خەرکی دەوروپشت سەریان سوڕ دەمینێ لەم هێزەی موحەمەد، ئەحمەد بە موحەمەد دەرێ ئێمە لەمەودوا بووینە برا، من دەڕۆم تۆش ئاگاداری ماریێ بە، محەمەد دەرێ: بۆ کام ڕێگا دەڕۆی گەر درەنگ گەڕایەوە بێمەدوات، ئەحمەد دەرێ زوو دەگەڕێمەوە، لۆ بەیانی سواری ئەسپەکەی دەبی و دەڕوا محەمەد کورسیەك دروست دەکات لە حەوشەکەدا لەسەری دادەنیشێ دەرێن جیرانێك سەری هەردەکێشی دەیەوێ سەیری ژنەکەی ئەحمەد بکات، محەمەد خۆی لێ تورە دەکات دەرێ جارێکی دی سەر هەربکێشی دەتکوژم، کابرا لە ترسان دەرێ تۆبە جارێکی دی سەر هەرناکێشم، محەمەد شەو ڕۆژ لەحەوشە نانی دەخوارد و دەنووست، هەرچەندە، ژنی ئەحمەد دەیگۆت وەرە ژوورێ، محەمەد دەیگۆت ئەحمەد بگەڕێتەوە، ئەوجا دێمە ژۆرێ جیرانێکیان لەنێو خەرك وا بڵاودەکاتەوە کە هەرکەسێك بەپێش دەرگای ماری ئەحمەد بڕوا محەمەد دەیکوژێ، یەکێك دەرێ من بەپێش دەرگایان دەڕۆم گەر ئازایە قسەی دەکات کابرا بە پێش دەرگایەکە دادێت و سەیری حەوشەکە دەکات، محەمەد بانگی دەکات و دەرێ بێرە داهاتی بێرە نەگەڕێیەوە، کابرا دەرێ دەگەڕێمەوە و کەس نیە بە من برێ دوو برۆت لەسەر چاوانە، محەمەد دەرێ زەرەر دەکەی، کابرا دەگەڕێتەوە، محەمەد دەچێتە پێشی و دەرێ نەمگۆت نەگەڕێیەوە یەك زللەی لەبن گێی دەدا و سەری دەپەڕێ و بەبەردێك دەکەوێ و مێشکی لەکونی گێی دێتەدەر، بەم ڕووداوە خەرکەکە زۆر ترسیان لێ دەنیشێ و مەیتی کوڕەکەش چەند ڕۆژێ لەوێ دەبێ لەترسان نەدەوێران بیبەنەوە دواتر محەمەد داوای کرد مەیتەکە ببنەوە ئینجا بردیانەوە، ئەحمەدیش دوای چەندین ڕۆژ دەگاتە شوێنەکە و سەیری ناو ئاوەکە دەکات بە هەزاران دوڕی تێدایە چەندین دوڕ خڕدەکاتەوە و لەکاتی خڕکردنەوە دەبینی پشکە خینەك لەسەر شاخێك دێتە خوارەوە دەکەوێتە ناو ئاوەکە و دەبێتە دوڕ، سەری سوڕ دەمێنێ لەدوای خینەکە دەچێ و بەرەو شاخەکە هەردەگەرێ دەچێتە



سەرشاخەکە دەبینێ، ژنێك لەنێو کونە شاخەکە سەربڕایە و خینی ئەم ژنە دێتەخوارێ دەبێتە دوڕ، کونە شاخەکەی گەورە دەکات و دەچێتە ژوورێ لەناوی ئەشکەوتێکی زۆر گەورە دەبی، دەبینی چەندین سەر لەسەر بەردی ئەشکەوتەکەدا هەیە و ئافرەتەکەش مردووە، بەرێنیدا شەو لەوێ بمینێتەوە، دەچێ هەندێك پووش دەهێنێ و لەسوچێکدا خۆی لەژێر پووشەکە حەشار دەدات، شەو دادێ و لەهیکڕا گێی لە دەنگێ دەبێ شاخەکان لەبەری دەلەرزین بەژوورێ دەکەوێ، ئەحمەد لە شوێن خۆی بەدزییەوە سەیری دەکات دەبینی کافرێکە، دەستی لۆ قۆدییەك دەبات و دەستی دەخاتە ناو قۆدیەکە و هەندەك دەرمان دەردەهێنێ و لەسەری ژنەکە دەدات ژنەکە چاك دەبێتەوە و پێی دەرێ: نایەمە سەردینتان، کافرەکە سەری دەبڕێ و وەك جارانی لێدەکاتەوە، شەو دەڕوا و بەیانی کافرەکە دەچێتە دەرەوە و لەپاشان ئەحمەد لە قوژبنەکە دێتە دەرێ و قۆدیەکە دەکاتەوە و دەرمانەکەی لەسەری ژنەکە دەدات و ژنەکە چاك دەبیتەوە و بەو کارە ژنە سەرسوڕمان دەبێ، دەرێ چۆن هاتیە ئێرە ئەحمەد بەسەرهاتنی خۆی لۆ دەگێرتەوە ئینجا دەرێ ئەی بەسەرهاتی تۆ، ژنە دەرێ ماوەی /٢٠/ سارە ئەم کافرە ئەو کارەی بە من دەکات /٢٠/ برای من بەناو چەم و چیا کەوتینە هیچیان ناوێرن بگەڕێنەوە ماریێ، هەتا نەبێتە ئێوارە، بەیانیانیش پێش ئەوەی رووناك دابێت، مار بەجێ دێلن، ئەحمەد دەرێ چار چییە ژنە دەرێ چار نییە، لێرە دەربچین دەمانکوژی، ئەحمەد دەرێ من چارەیەکت لۆ دەکەم بەقسەم بکە ئێوارێ کە کافرەکە گەڕایەوە پێی برێ رووحت لەکێیە، ئینجا هەر کە گۆتی: ئەوا دەیکوژین، ژنە دەرێ باشە بەیەکەوە دەبن تا نیزیك ئێوارە ئینجا ئەحمەد سەری ژنە دەبڕێ و وەك خۆی لێ دێتەوە و ئەحمەدیش دەچێتە جێیەکی خۆی حەشار دەدات، پاش ماوەیەك کافرەکە دەگەڕێتەوە وەك جاران، ژنەکە دەرێ هەموو ڕۆژ سەرم دەبڕی خۆ من ئینسانم و روحم هەیە و دەبا لێرەبم کافرەکە دەرێ باشە ئەوە بەرێنمدا سەرت نەبڕم ژنە دەرێ روحی خۆتت نیشانمدا سەبووریم پێی دێت، کافرەکە دەرێ لەناو مەسینەیە، ژنە مەسینەکە دەهێنێ و دەیڕازێنێتەوە، کافرەکە پێدەکەنی و دەرێ: ئەقری ژن

ئەوهایە چۆن روح لەناو مەسینە دەبێت، ژنە بەتوورەیی مەسینەکە فڕێ دەداتن ئەم جارە دەرێ لەناو پێراوەکەتە ژنەکە پێراوەکە دەینی و دەیڕازێنێتەوە، دیسان کافرەکە دەرێ روح چۆن لەناو پێراو دەبێت، پێراوەکە فڕێ دەدات، ئەم جارە دەرێ بەڕاستی دەرێم رووحم لەناو چێرەکی ڕەش دایە کە هی میریە، لەناو چێرەکە بەرازێکی تێدایە لەناو بەرازەکە گورگێکی تێدایە، لەناو گورگەکە سەیەکی تێدایە لەناو سەیەکە کێروشکێکی تێدایە، لەناو کێروشکەکە شوشویەکی تێدایە، لەناو شوشەکە کرمێکی تێدایە ئەو کرمە رووحی منە، ژنەکە گۆتی باشە، شەو دەڕواو بەیانی دەچێتەدەرەوە، ئەحمەدلەقوژبنەکە دێتەدەرێ و ژنە بەسەرهاتی لۆ دەگێرێتەوە، ئەحمەد دەستی دەداتە شیرو دەڕوا لۆ ناو مێگەرەکە و چێرەکە دەبینی و بەشیر لێی دەدا دەیکوژی بەراز دێتەدەر ئەویش دەکوژی گورگ دێتەدەر، دەیکوژی ئینجا سەیەکە دێتەدەر دەیکوژی کێروشك دێتەدەر دەیکوژی شوشویەك دێتەدەر ئەویش دەشکێنێ کرمێك دێتەدەر، کرمەکەی دەخاتە سەردەست لەهیکرا دەنگێك هات وەك گەوارەی بەهاران لەدوورەوە کافرەکە هاواری بوو کرمەکەشی کوشت کافرەکە دەتۆپی، دوای ئەمە دەگەڕێتەوە ناو ئەشکەوتەکە، ژنە زۆر درخۆش دەبێ و دەرێتە ئەحمەد لەبەر ئەوەی ئەم چاکەیەت لەگەر منداکرد حەراری تۆم ئەحمەد دەرێ من ژنم هەیە، ژنە دەرێ باشە گەر ڕازی بوو، حەراری تۆم رازی نەبووم خوشکی تۆم، ژنە زۆر لەژنەکەی دی جوانتر و ئاقرتربوو، ئەحمەد دەرێ با هەندێك دوربهێنم ئینجا دەڕۆین، ژنە دەرێ پێویست ناکات خوێنی من دەبێ بە دوڕ، ئینجا ئەحمەدو ژنەکە دەگەڕێنەوە گوندەکەو ئەحمەد دەرێتە ژنەکە تۆ لێرەبە من دەگەڕێمەوە مارێ پرسەك بە ژنەکەم دەکەم و ئینجا دەگەڕێمەوە دوات، ژنە دەرێ باشە ئەحمەد دەچێتەوە مارێ و محەمەد و ژنەکەی بەگەڕانەوەی زۆر درخۆش دەبن، دوای پشویەك ئەحمەد بەسەرهاتی خۆی لۆ دەگێرێتەوە ژنە دەرێ من رازیم گەر لەمن ئاقرتر و جوانتربوو با ئەو دانیشێ و من خزمەتی دەکەم گەر من لەو جوانتر بووم من دادەنیشم و با ئەو خزمەتم بکات، ئەحمەد دەرێ باشە دەچێتە دوای و دەیهێنێ و بەسەرهاتی لۆ دەگێرێتەوە، ژنەکەی



ئەحمەد کە ژنەکە دەبینێ دەرێ ئەشهەد و لە من جوانترە دوای کەمێك گفتوگۆ دەرێ لەمنیش ئاقرترە با ئەو دانیشێ و من هەموو کارێك دەکەم و لە خزمەتیشی دادەبم، بەڵام ژنە دەرێ نەخێر من بەو جۆرە رازی نیم وەك جووتە خوشکێك بەیەکەوە دەژین، بەم جۆرە هەردوولا رازی دەبن، دەرێن لەم کات خزمەتکارێکی میری دێتە ماریان بەدوای ئەحمەد، کە ئەحمەد دەچێتە لای هەردوو ژنەکەی لەگەری دەچنە دەرێ، کە خزمەتکارەکە چاوی بە ژنەکان دەکەوێ و ئاگادارە لەوەی کە پێشتر یەك ژنی هەبوو، دوای گەڕانەوەی بۆتە دوان سەرسورمان دەبێ، بەتایبەت لەجوانی ژنی دووەم، ئەحمەد دەرێتە خزمەتکارەکە تۆ بڕۆ ئێستا بەخۆم دێم و شتەکانیش دەهێنم، ئەحمەد دەچێتە ژوورەوە داوا لە ژنەکە دەکات، ژنەش بەچەقۆیەك لەدەستی شوێنێکی خۆی بریندار دەکات و چەندین دڕۆپە خوێن دەخاتە ناو مەنجەرێکی ئاو هەموو دەبن بە دوڕ، ئەحمەد شەش دوڕ دەخاتە گیرفانی دەیبات کە دەگاتە دیوەخان دوای سەلام کردن و سەلام وەرگرتنەوەمیر دەرێ: هێنات ئەحمەد دەرێ بەرێ شەش دوڕی دەخاتە دەست میری کە چاوی پێکەوت شاگەشکەبوو گۆتی ئەحمەد دەبێ هەرلەم گوندە بی چیت دەوێ لۆت بکەم، دەرێ خۆشی تۆم دەوێ ئینجا دوعابوون دەخوازێ و دەگەڕێتەوە، دوای گەڕانەوەی ئەحمەد لەدوای شقلوم دەنێرێ شقلوم دێت، میر دەرێ چ، شقلوم ئەی لۆ گەڕاوە شقلوم دەرێ هەردەبی لەناویبەرین، خزمەتکارەکە دەرێ میرم ئەحمەد ژنێکی دیکەی هێناوە،گەلێك لە ئەوی تر جوانترە، میر ئەم قسەیە زۆر کاری لێدەکات، دەرێ شقلوم تەگبیرێکی بکە شقلوم دەرێ دوای چەند ڕۆژێکی دیکە تەگبیرەکی وات لۆ دەکەم ئەوجارە نەگەڕێتەوە، ئەحمەد و ژنەکانی و محەمەد دەچنە بازاڕ و جلوبەرگی نوێ دەکڕن و دواتر سێ ڕۆژ لەدوای یەك دەچنە چێشتخانە نان دەخۆن و ئەوانەی لەوێش نانیان بخواردبایە ئەوان پارەکەیان لۆ دەدا، لە دوای ئەم سێ ڕۆژە، خانوویێکی گەورە دەکڕن و ماریان دەگوازنەوە لۆ ئەم خانووە، میریش دوای چەند ڕۆژێك لەدوای شقلوم دەنێرێ دەرێ چیتکرد، ئەویش دەرێ میرم لەدوای ئەحمەد بنێرە بابێتەلات تۆش داوای لێبکە بچێ هەنجیری چلێ تامت لۆ بهێنێ ئەو کات ئەو

هەنجیرەی پێنایەت و دەفەوتێ، هەروا دەرێ گەورەم ئەم هەنجیرەیەبەکەس نەهاتیە هەتا بەئەو بێت خاوەنی کیژەکە سەرۆکی هەموو دێوی دنیایە هەرلەوێ نزیك بیتەوە دەفەوتێ، میر لەدوای ئەحمەد دەنێرێ ئەویش دێت و میر داوای لێدەکات دەبێ بچێ هەنجیری چل تام بهێنی ئەحمەد دەرێ میر چۆن ئەم هەنجیرەم پێ دێت هەر نازانم لەکێیە، میر دەرێ گەر لەسەر زەوی بێت یا لە ئاسمان دەبێ هەربیهێنی گەر نەیهێنی لەسەرت دەدەم، ئەحمەد دەرێ باشە، مۆرەتی دوو مانگم پێبدە، میر دەرێ باشە، ئەحمەد زۆر بەعاجزی دەگەڕێتەوە مارێ، محەمەدو ژنەکانی لێی دەپرسن لۆ عاجزی، ئەویش بەسەرهاتەکەی لۆیان دەگێڕێتەوە، ژنی گچکەی دەرێ: ئەوە خەمی هەر ناوێ، داکم لۆت جێبەجێ دەکات، هەرچوویە لای بەسەرهاتی منی لۆ بگێڕەوە بەئاسانی رێگایەکت لۆ دادەنێ، بەڵام ڕێگا زۆر ترسە، ئەحمەد گێ بگرە تۆ دەڕۆی بەرەو رۆژهەڵات ماوەی سێ ڕۆژ دەڕۆی دوای دەگەیە گردێکی زۆر گەورە تەماشای سەر گردەکەی دەکەی تەمەکی زۆر دەبینی تەمەکت دیت دوایی خۆت دەپارێزی هەتا نێزیك تەمەکە دەبیت دەبینی ژنەکی گەورە وەك پارەوانە دانیشتیە هیچ بەرگی لەبەر نییە، مەمکەکانی زۆر گەورەیە، مەمکی راستەی لەسەر ملی چەپی دانایە، مەمکی چەپی لەسەر ملی راستی دانایە، ئەوە دایکمە هەر نێزیکی بووی، خۆت فڕێدە کۆشی مەمکی راستی بگرەکە لەسەر ملی چەپیەتی، بەدەمت مەمکەکانی بمژە، نامەیەکیشت لۆ دەنووسم، لەم کات نامەکەی بخەرە باوەشی، بەڵام هیچ مەترسە و دوایی خۆت لێی ئاشکرا بکە و بەسەرهاتی خۆتی لۆ بگێڕەوە، لۆت جێبەجێ دەکات، ئەحمەد دەرێ باشە، ئینجا بەیانی دەڕوا بەگوێرەی قسەکانی ئەو هەتا دەگاتە لای ژنەکە مەمکی راستی دەمژی و نامەکەشی دەخاتە کۆشی، ژنەکە بۆنی کرد ئەحمەد کەوتە نێو لوتیەوەو دەری هێنا، ئەحمەد بێهۆش بوو وەك ئەوەی کە سارێك نەخۆش بێ، ژنە نامەکەی خوێندەوە زانی کەکیژەکەی لۆی ناردووە بەسیحرێك ئەحمەد هەستاوە، ژنە زۆر درخۆش بوو، ئەحمەد لەلای ماوە.



ئێوارە کوڕەکانی گەڕانەوە، ئەوکات ئەحمەدی حەشاردابوو، ژنە کە کوڕەکانی/٢٠/ کوڕبوو پێی گۆتن گەرپیاوێك خوشکەکەتانی لەکافرەکە رزگارکردبێ چی لۆ دەکەن گۆتیان خوشکمان قابیل بەئەوەو چیمان پێبکرێ لۆی دەکەین، لەپاشان بانگی ئەحمەد دەکاو بەسەرهاتەکەیان لۆ دەگێڕێتەوە ئەوانیش زۆر درخۆش دەبن و چیت بوێ بۆت دەکەین، ئەویش دەرێ لۆ هەنجیری چل تام هاتووم، دەرێن بەدایکمان برێ رێگا چارەیەك دابنێ دواتر خەمت نەبێ دەتگەینینە وڵاتی هەنجیری چل تام، دایکی کوڕەکان دەرێ: ئەم کارە زۆر گرانە بەگێی من دەکەی دەگرێتەوە، ئەحمەد دەرێ: سەرەکم هێناوە نایگەڕێنمەوە، ژنە دەرێ گێ بگرە یەکەم جار دەگەیە خاکێکی زۆر بە درك، دڕکەکان لەپێت ڕادەچن خینی لێدێت، بەڵام تۆ دەرێی ئەم خاکە چەند خۆشە، گەر نزیك وڵاتەکەمان بایە، هەموو جار دەهاتم لۆ ناو ئەم خاکە لۆ سەیران، دوای تێپەربوونی ئەمە تووشی کانیەك دەبی، تامی ئاوەکەی زۆر ناخۆش و تارە، تۆ دەرێی ئاوی ئەو کانیە چەند خۆش و شیرینە، دوای ئەمەش لەسەر رێگا ئەسپەك، دەبینی لەلای رێگایەك، شێرەکیش دەبینی لای رێگەکەی دی، ئەسپەکە گۆشتی لەپێشەو شێرەکەش گیای لەپێشەو تۆ گۆشتەکە دەبەیە پێش شێرەکەو گیایەکەش دەبەیتە پێش ئەسپەکە و دەڕۆی، دواتر تووشی قەسرێك دەبی چەندین پاسەوانی بەدیار راوەستاون هەر یەك بەکەیفی خۆی یەك شەبقەی خوارە، یەك قایشی بوویتەوە، هەریەکێك عەیبێکی هەیە، بەڵام تۆ دەرێی ئەم پاسەوانانە چەند جوان ڕاوەستاون گەر پارەم پێبا پێم دەدان، بەڵام هیچم لەگەر خۆم نەهێنایە لەدوای ئەمە دەچیتە ژوورەك دەبینی کیژەك نووستیە لەڕاست سەری داری هەنجیری چل تام لەبەرهەتاوە سەرەکی شین بوویتەوە لایەکی لێ بکەوەو بەشوێن خۆت بگەڕێوە، هەنجیرەکە لەپێش تۆ دەگەرێتەوە مارێ، ژنە ڕووی لە کوڕەکانی کرد و گۆتی کامتان زوو دەیگەیەننە وڵاتی هەنجیری چل تام یەکیان گۆتی بە /٤٥/ دەقە دەیبەم، یەکێکی دی گۆتی بە /٣٠/ دەقە دەیبەم، یەکێکی دی بە /١٥/ دەقیقە دەیبەم، یەکێکی دی بە /١٠/ دەقیقە، دەیبەم، یەکێکی دی بە /٥/ دەقیقە دەیبەم، یەکێکی دی بە /٤/ دەقیقە دەیبەم ،

یەکێکی دی بە /٣/ دەقیقە دەیبەم، یەکێکی دی بە /٢/ دەقیقە دەیبەم، یەکێکی دی بە /١/ دەقیقە دەیبەم و دواتر دەگەڕێمەوە، دایکی دەڕێ باشە تۆ بیبە، لۆ بەیانی ئەحمەد لەپشت کوڕەکە سواری ئەسپ دەبێ و دەڕوا دەیگەینێتە شوێنەکەو لەوێش دوو داوە مووی دەداتێ و دەڕێ ئەم دوو داوە مووە لەبەردی ستی بدە لەلات ئامادەم، ئەحمەد دەڕێ باشە، کوڕە دەگەرێتەوەو ئەحمەدمیش دەڕوا، ژنە چ تەگبیرەکی لۆکردبوو وایکرد، کیژەی بینی سەرسوڕمان بوو لە جوانی/٦٦٦/پەردەی بەسەری دادرابوو هەرپەردەی/٥٠/ گرێێ لێدرابوو، /٤٩/ گرێی کردەوە، بەڵام چی دیت هەرچەند برێی جوان، هەنجیرەکەی لێکردەوەو گەڕاوە، ئاوڕێکی لێرە داوە تامەزرۆی ماچەکی کردو گەڕاوە لای و دەمی لۆ روومەتی دەبات بە هەرمی دەمی خارێکی ڕەش پەیدادەبێ دری نایە ماچی بکات دەڕێ ئەم ڕوومەتە ڕەش هەردەگەڕێ، دەگاتە لای دەرگا ئاوڕێکی لێ دەداتەوە دەبینی ڕەشایەکە نەماوە، دیسان دەگەڕێتەوە لای دەمی لۆ روومەتی دەبات هەم خارێکی رەش پەیدادەبێ ماچی ناکا دەگەڕێتەوە لای دەرگا بڕوا هەم دیسان ئاوڕێك دەداتەوە دیسان تامەزرووی ماچەکی هەستا دەگەڕێتەوەلای و دەڕێ دەبا سەد خاری ڕەش پەیدا بێت ماچەکی لێ دەکات، خارێکی ڕەش پەیدادەبێ، ئەحمەد دەڕوا دەمەکی پێدەچێ کیژە هەردەستێ کەسەیر دەکا، دەبینی هەنجیری چل تام نەماوە کیژە بەدەنگێکی بەهێز هاوار دەکات، پاسەوانان ئەم کابرایە بگرن، پاسەوانەکان دەڕێن ئەمە چەند سارە لێرەین کەس نەیگۆت ئەم پاسەوانانە چەند جوان و ڕێك و پێکن، ئەگەر پارەی پێبا پارەشی دەداینێ، بابڕوا، کیژە دەرێتە ئەسپ و شێرەکە ئەم کابرایە بگرن، شێر دەڕێ چەند سارە لێرەم کەس نەهاتووە ئەم گیایەم لەپێش لاببا هەندێك گوشتم بێنێتە پێش، بەڵام ئەم کابرایە ئەم گیایەی لەپێش لابردم و هەندێك گۆشتی هێنایە پێشم لۆ خۆی با بڕوا، بەخواردنەکەم خەریك دەبم، ئەسپەکەش دەڕێ ئەوە چەند سارە ئەو گۆشتەم لەپێشە کەس لای نەبرد، بەڵام ئەم کابرایە لای بردو هەندێك گیاشی لۆ هێنامە پێش، منیش دەڕێم بابڕوا لۆ خۆی ئەحمەد لەوڵاتی هەنجیری چڵ تام دەرپەڕی ئینجا دوو داوە مووەکە دەردەهێنێ و



دەیخاتە نێوان دووبەردی ستی و کۆری ژنەکە لەوێ ئامادە دەبێ سواری ئەسپەکە دەبێ و دەگەڕێتەوە لای ژنەو، کوڕەکانی شەو لەوێ دەبێ و بەیانی دوعابوون دەخوازی و دەگەڕێتەوە ماڕێ، محەمەد و ژنەکان زۆر درخۆش دەبن، بەهاتنەوەی ئەحمەد بەسەرهاتی خۆی بەتەواوی دەگێرێتەوە، دوای پشوویەك ئەحمەد هەنجیری چل تام دەباتە دیوەخان و لەپێش میر دادەنێ، میرو وەزیرەکان و کاربەدەستان سەیری دەکەن و تامی دەکەن تەواوە سەرسورمان دەبن، میر دەڕێ ئەحمەد چیت دەوێ لە دونیا، بقلوم دەڕێ گەورەم لە جێی من بیکە بە وەزیر، ئەحمەد دەڕێ قبورم نیە، من هیچم ناوێ دەگەڕێتەوە، ماڕێ و ئێوارە دادێ و کات دەگاتە بەیانی مەلا لەکاتی بانگدانا غەلەت دەکات هەرچەندە، دووبارەی دەکاتەوە هەر غەلەت دەکات، ئەویش بەهۆی بینیی ئەو هەزاران رەشمارەی کە لەدەوری ئەم گوندە هەردراوە، دونیا رووناك دەبێت و خەرك دێتەدەرو ئەو هەزاران رەشمارەی دەبین هەموو لەشکرە سەرسورمان دەبن خەرکەکە کۆمەر کۆمەر دەچنە پێش دەرگای میر تابزانن ئەمە چییە، میر قاسیدەك دەنێری و دەگەڕێتەوە دەڕێ میری گەورەم سەرلەشکرەکەی کیژەکە دەڕێ هەرچی هەنجیری چل تامی بردووە، لۆم بانگ بکەن مێردی پێدەکەم، کوڕە وەزیر دەڕێ من دەچم دەڕێم من بردوومە دەچێتە لای کیژە و دەڕێ من بردوومە کیژە دەڕێ چۆن بردووتە کوڕە دەڕێ من نیشانەشکێنێکی زۆرباشم رۆژەك چوومە بن چیایەکی زۆر گەورە تەماشام کرد هەنجیری چل تام بەقەراغ چیایەکەیە زۆر برندبوو، بەڵام بەتفەنگ گوللەیەکم تێ گرت لەهەنجیرەکەم داو خستمە خوارەوەو هەرم گرت و لۆ میرم هێنایەوە بەدیاری، کیژە پێکەنی و گۆتی: کەواتە حەلالی تۆم دەوەرە دەستت بێنە، کوڕە وەزیر دەستی لۆ دەباو دەستی ڕادەتەکێنێ و زللەیەکیشی لێدەدا، کوڕە وەزیر بەو دەردە دەگەڕێتەوە ماڕێ، کوڕی قازی لەنێو گوند دەڕێ من هەنجیری چل تامم هێناوە کەس نەیهێناوە دەست دەداتە تیروکەوان و سواری ئەسپ دەبێ و دەچێتە لای کیژەکە و دەڕێ، من هەنجیری چل تامم هێناوە کەس نەیهێناوە، کیژە دەڕێ چۆنت هێناوە کوڕی قازی دەڕێ من لەتیروکەوان زۆر ئازام ڕۆژێك لەڕاو دەگەڕامەوە شەوم

بەسەرداهات، شەو خۆم گەیاندە نێو ئەشکەوتێك و لەوێ ئاگرم کردەوەو دانیشتم سەیری رۆخی ئەشکەوتەکەم کرد بۆنی هەنجیری چل تامی لێهات لەنێو رۆخەکەی شین ببو، بەڵام زۆر برند بوو، هەربەوشەوە تیرەکەم تێگرت و هەنجیرەکەم خستە خوارەوەو دوایی لۆ میرم هێنا بەدیاری، کیژە دەرێ هەی ئافەرین دیارە زۆر زیرەکی دەوەرە پێش دەستت بینە، لۆ دەستم هەر لۆ تۆ باشم، ئەویش دەستی دەبات، کیژە دەستی ڕادەتەکێنێ و لەبنڕای دەردەهێنێت، زللەکیشی لێدەدات، ئینجا دەرێ بەم جۆرە بڕۆ بەمیر برێ لۆ ماوەی یەك سەعاتی دی لۆم ئاشکرا نەکات ئەو گوندەی سەرەوبن دەکەم هەموتان سەردەبڕم کوڕە ئەم هەوارە بەمیر ڕادەگەیەنی و میریش لەدوای ئەحمەد دەنێری، ئەحمەد دەچێتەلای میر، میر دەرێ ئەحمەد چۆن توانیت هەنجیری چل تام بدزی، برۆ ئازایەتی خۆشت بەرامبەر بەو لەشکرە دەربڕە، برێ من هێناومە ئەحمەد دەرێ باشە دەچێتە لای کیژە و دەرێ من هێناومە، کیژە دەرێ چۆن ئەحمەد ئاوێنە دەردەهێنی و دەیداتە کچەکەو دەرێ سەیری خۆت بکە، کیژە سەیری خۆی دەکات خاڕێك لەسەر ڕوومەتی پەیدا بووە، یەکسەر دەرێ من حەڵاڵی تۆم لۆ کەس نابم، داوا لەشکرەکە دەکات بگەڕێنەوە مارێ و لەخۆی مارە دەکات، ژنە دەرێتە ئەحمەدی ئەو میرە لەگەر تۆ خائینە بەگوێی من دەکەی با لەناوی بەین، ئەحمەد دەرێ من رازی نیم، ژنە سیحرباز دەبی هەروا سەرۆکی پارەوانانی دێوی دنیا دەبی، شقلومیش هەر لەبەرمیر دەخوێنێ لۆ لەناوبردنی ئەحمەد، دەرێ ئەحمەد لەناو نەبەین سەرمان دەخوا، ئەمجارەش بەمیر و شقلوم تەگبیرەك دەکەن و بەدوای ئەحمەد دەنێرن،ئەحمەدیش دێتەلایان و بەمیر دەرێ دەبێ ئەمشەو پردێکی زێڕمان لۆ دروست بکەی، لەم بەری رووبار بۆ ئەو بەری رووبار، گەر دروستی نەکەی لەسەرت دەدەم، هەرچەندە ئەحمەد دەرێی چۆن شتی وا دروست دەکرێ،بێسوود دەبێ، دەرێ دروستی نەکەی لەسەرت دەدەم ئەحمەد بەعاجزی دەگەڕێتەوە مارێ، ژنەکان و محەمەد لێی دەپرسن لۆ عاجزی ئەویش بەسەرهاتەکە دەگێڕێتەوە، ژنی گچکە دەرێ ئاسانە تۆ وەرە دەست بخەرە گەردنم تابەیانی، خەم مەخۆ کەبەیانی هەستای لەخەو پردەکە



دروست کراوە دوای ئەمە هەموو وەزیر و حاکمەکان دەخەمە ناو رووبارەکە، ئەحمەد بەم قسەیە کەمێك درخۆش دەبێ، ژنە بەسیحر چەندین پارەوانی لەوێ ئامادەکرد، گۆتیان بفەرموو خانم، ئەویش دەرێ: دەبێ ئەم شەو پردێکم لە زێڕ لۆ دروست بکەن.

لەوسەری رووبار لۆ ئەو سەری رووبار، بەڵام بەیانی کە میرو وەزیرو حاکم هاتنە سەرپردەکە فڕێیان بدەنە ناو رووبارەکە، بەیانی مەلا بانگ دەدات غەلەت دەکات چونکە دنیا لەپێش چاوی زەرد هەرگەرابوو حەوت جار بانگ دەدا هەر غەلەتی کرد، خەرکەکە هەردەستن دەبینن پردێك لەزێر دروستکراوە سەرسوڕمان دەبن، ئینجا میر و وەزیرو حاکمەکان دەچنە سەر پردەکەو دەگەنە ناوەندی پردەکە هەموویان فڕێ دەدەنە ناو رووبارەکە و دەخنکێن تەنها وەزیری دەستەچەپ بقلوم نەچووبوو ئەو لەژیان ماوە دوای ئەمە خەرکەکە بەگشتی هاواریان دەکرد ئەحمەدمان دەوێ بەمیر، ئەحمەد دەبێ ببێ بەمیر ئەحمەد دەبێتە میرو محەمەد وەزیری دەستە ڕاست و بقلومیش وەك پێشوو بە وەزیری دەستەچەپ دەمینێتەوە، خەرکەکە دەکەونە خۆشی بەم گۆڕانکارییە منیش کراشم دڕاو چم پێنەبڕا.

---

※ ئەم هەقایەتە فۆلکلۆرییە ئەفسانەییە لە سەرهەنگ هاشم گوێ بیست بوویمە.

※ لە گۆڤاری کاروان ژمارە ١٤٥ ئایاری ٢٠٠٠ بڵاوکراوەتەوە.